چیرۆک

# سەربازێکی نەناسراو

چیرۆکێکە لە ناودڵی مێژووەوە

حسن پنجوینی

# پێشـەکی

ئەو ڕووداوە سـامناكو دڵتەزێنانەی کە لەسـەدەی چواردەیـەمی زاینیـــدا ڕوویاندا ، هەرگیز مێژوو بەخۆیەوە نەدیوەو لەوانەیە بەخۆیشی‌یەوە نەبینێ ..

چەندەها وولات وێرانکرا !.. چەند تەختی شاهان سەرەوليژ کـرا ! .. چەندەها زانستگا خاپورکـرا ! چەندەها کتێبخانە سوتێنرا ! هـەزارەها زانا خنکێنرا ! جۆگەلەی خوێن لەچەندەها وڵاتەوە هەڵبەسترا !

پاشایەتی « خەلافەت » عەبباسی لەڕەگو ڕیشەدا هەڵکێشرا ، بە خنکاندنی « مستعصم باللە »ی دوا پاشای ئەو بنەماڵەیە ..

ئەگەر عەقیدەی ئیسلامی خاوەنی هێزی بەرگری‌و خۆڕاگرتن نەبوایە .. ئـەو هێزەشی لـەهێزی داگیر

کەران‌و وێرانکەران ، بەتواناترو گەورەتر نەبوایە ..
تەنیا ئەم ڕووداوە سامناکە بەس‌بوو ، بۆ لەخشاندن‌و لەق
بوونی بیرو باوەڕ لەدڵ‌و دەروونی خەڵکیدا .. لەگەڵ
ئەوەدا ئـەم ئاینـە توانی بەهۆی چەندەهـا سەربازی
نەناسراوەوە سەرکەوێت بەسەر دوژمنانیاو خۆی بکوتێ
بۆدڵ‌و دەروونیان‌و ملکـــەچیان بکـــات بۆ پەیڕەوی
بەرنامەکەی ..

ئەو مەغۆلەی کەجیهانی پڕکردبوو لەبیم‌و ترس‌و
سوپای بێ‌ژمارەیان هـــەمیشە لەسەرکەوتندا بوو . وە
لەهەموو هێرشێکیاندا باقەگوڵی سەرکەوتنیان لەسەردەنا
.. ئالەم کاتەدا کە هەموو نەتەوەکان بەتاریکە شـــەوی
ڕووداوە دڵتەزێنەکان داپۆشرابوون .. ئـەم ئاینە توانی
مەغۆل تێك شکێنێت لەبارەی بیروباوەڕەوە ..

ئێمەی موسڵمانیش ، ئەمڕۆ لەهەموو ڕۆژێك زیاتر
پێویستمان بـــەوە هـــەیە لەڕووداوەکانی مێژوو دەرز
وەرگرین ، وەدەست بەو چەکە بەکارەوە بگرین ، کـە

لەڕۆژێکی ناهەمواری وادا یارمەتی داین و چاکەیەکی زۆر گەورەی لەگەڵ کردین ، کەهیچ جۆرە چەك و سوپایەکی مەشق دراو فریامان نەکەوت ..

چەند جێگەی خۆیەتی ئاوڕێ لەو ئاینە بدەینەوەو بیکەینە ڕێبازی ژیانمان کەبەسەر دڕوندە ترین سوپادا سەری خستین و زاڵی کردین ، کەبەشێوەی لەشکرکەشی ، زۆر بەناهەمواری لەبەرامبەریەوە تێشکاین !!

چەند پێویستمان بەو ئاینە هەیە ، کە هەمیشە هۆی سەربەرزیمان بووە .. وە هەرکات ڕووداوی ڕۆژگار کەڵبەی لێ‌سوی‌بین و دیانە جیڕەی لێ‌کردبین و چاوی لێ‌زەق کردبینەوە فریامان کەوتووە !!

خـوا لەعومەری کوڕی خەتاب ڕازی‌بێ کە فەرمووی : « بێ‌گومان ئێوە لەهەموکەس ، سوك و ڕسوا تربوون ، خوا بەهۆی ئیسلامەوە سەربەرزی پێ‌دان .. هەرچەند بتانەوێ بەهـۆی شتێکی‌تر جگە لەئیسلام سەربەرزبن ، خوا زەلیل و ڕسوا ترتان دەکات .. »

ئەم چیرۆکەش ڕووداوێکی واقیعی‌یەو هەڵێنجراوی ناودڵی مێژووەو دەری‌دەخات ئەم ئیسلامە لەبەرامبەر هەموو گەردە لوول‌و ڕەشەبای بەهێزی دوژمنانیا چەند خۆگروجێرە .. وە دەوری چەند زانایەك پیشان دەدات کەوەك سەربازی نەناسراو لەپێناویا تێکۆشاون‌و گیان‌و ماڵیان بۆ بەخت کردووە بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشت بن لە هیچ کەسێك جگە لەخوا ..

جا وامنیش ئەم چیرۆکەم پێش کەش کرد بە خوێنەوارانی تازەپێ‌گەیشتوو تا هەوڵ‌و کۆششی موسڵمانانیان لەپێش‌چاوبێ..وە ئەوەش حاڵی‌بن کە خوا ئەیەوێ ئەم ئاینەی خۆی پایەدارکات‌و بیهێڵێتەوە ، هەرچەند هێرش‌و شەپۆلی دوژمنانی ، فراوان‌و گەورەبێ .. وە هەرکەس هەوڵی بۆنەدا خۆی زیان‌دەکات چونکە لە جێگایەکی‌ترو شوێنێکی‌ترەوە خوا کۆمەڵێك ئامادە دەکات هەوڵی بۆبدەن‌و بیکەیەنن بەخەڵکی‌تر ..

ئەوەتە قورئان دەفەرموێ : [ وان تتولوا یستبدل

قوما غيركم ثم لا يكون أمثالكم ] سووره‌تی محمد/٤٠ •
واته : ئه‌گه‌ر ئێوه پشت‌بکه‌نه به‌رنامه‌ی‌خوا ، ئه‌و باوه‌ڕه له‌دڵی میلله‌تێکی ترا دروست‌ده‌کات ، ئینجا وه‌ك ئێوه‌ش نابن له بێ‌گوێیدا ••

هیوادارم سوودی هه‌بێ بۆ خوێنه‌رانی به‌ڕێزو ئیتر داوای سه‌رکه‌وتنتان بۆده‌که‌م له په‌روه‌ردگاری مه‌زن •

**نووسه‌ر**

## سەرچاوە مێژووییە کان

١ ـ البداية والنهاية • اسماعيل ابو الفداء ابن الكثير ١٣٠٠ ـ ١٣٧٢ •
٢ ـ تأريخ الكامل • عزالدين ابوالحسن على ابن الأثير ١١٦٠ ـ ١٢٣٤ •
٣ ـ معجم البلدان • ياقوت الحموى ١١٧٩ ـ ١٢٢٩ •
٤ ـ الحوادث الجامعة في اعيان المئة السابعة • ابن الفوطى •
٥ ـ تأريخ الاسلام السياسى • سيرتوماس آرنولد •
٦ ـ الدعوة الى الاسلام • سير توماس آرنولد •
٧ ـ بۆشێوەی داڕشتنی چیرۆکەکە سوود وەرگیراوە لەکتێبی [ الدين الحق ] •

## ئاینی ئیسلام

سێرتۆماس ئارنۆلد ، دەڵێت :

« ... بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو کۆسپو تەگەرانەدا مەغۆلو هۆزە بەربەری یەکان گەردن کەچی ئاینی ئەو ئەلە موسڵمانانە بوون کە لەژێرپێی خۆیانا پلیشانبوونیانەوەو زەلیلیان کردبوون ..

دەبێ زۆر لە لایەنگرانی پێغەمبەر لەو ناوەدا هەبووبێو بەدرێژی و پانی وولاتی مەغۆلدا بلاوەیان کردبێو ـ بە نهێنی تێکۆشابن بۆ ڕاکێشانی ئەو کافرانە بۆ ناو ئاینی ئیسلام .. »

لە کتێبی « مێژووی ڕامیاری ئیسلام »
بەرگی ٤ لاپەڕە ١٥٣

## سپاردەیەکی قورس و گران ..

خەریك بوو کاروانەکە لە سنووری وولاتی بوخارا تێدەپەڕی و پێی دەنایە ناو دەشتی پان و بۆڕی ئاسیای ناوەڕاستەوە .. مامۆستا هەڵوێستەیەکی کردو ئاووڕێکی دایــەوە بەلای هــاوەڵە قوتابییەکانیەوە . بەقــووڵی سەرنجی دان و گوتی :

برایان ، باش بزانن و لێتان ڕوون بێت .. ئێمە بۆیە ماڵ و منــداڵ و نیشتمانو کــەس و کــاری خــۆمان جێهێشتووە .. وە ئەم دەشت و دۆڵ و قەدپاڵ و چیــاو کوێرە ڕێگایانە دەگرینەبەر .. تا ئــەرکی سەرشانمان بەرامبەر ئاینەکەمان بەجێ بێنین و بەو جۆرەی کە خوا داوامان لێدەکات دەستی خــەڵکی بگرین و ڕێنموونییان بکەین بۆ ئاینی پیرۆزی ئیســلام و ڕێگــای ڕاستیان پیشاندەین ..

هەروەك دەزانن ئێمە بۆ کڕین و فرۆشتن و کەلوپەلی

بازرگانی نەهاتوین ، هەرچەند ئەم کاری بازرگانی‌یەمان کردۆتە سەرپۆشێ بۆ مەبەستە پیرۆزەکەمان .. هەروەك گوتم : مەبەستەکەشمان گەیاندنی ئیســلامەو ڕەزامەندی خــوا ..

لەم کاتەدا مامۆستا کەمێك بێ‌دەنگ بوو .. دڵی پڕبووبوو ، فرمێسك لـــە چاوەکانیا قەتیس بووبوو !!
ئینجا هاتەقسەو گوتی : برایان ، شتێك هات بەخەیاڵما پێم‌خۆشە پێتان بڵێم ...

هاوەڵەکانی بەیەك‌دەنگ گوتیان : فەرموو ..
مامۆستا گوتی : برایان ، ئێمە بۆناو گەلێکی هەژارو ساویلکەو بێ‌دەسەڵات ناچین !! بەڵکـو بۆناو میللەتێك دەچین کە ناوبانگیان دەرکردووە بەزبری‌و دڕی‌و هێزو دەسەڵات‌و سوپای بێ‌ژمار !!

هەروەك دەزانن مەغۆل ئەو میللەتەیە کە لافاوی

لەشـــکری بێسنووریان چەندەها شـــاری موسڵمانانی وێرانکـرد •• ڕۆشنبیریو شارستانیەتیان لەناوبرد •• هەزارەها باخو باخاتیان ساراکڵ کرد !! کۆشکو تەلارە نایابەکانیان وێرانکردو کردیانە کەلاوە ••

مامۆستا فرمێسکی قەتیس بووی بۆ ڕانەگیراو بەسەر گۆناکانیا هاتەخوارەوەو ڕیشەتەنکەکەی تەڕکرد •• بە دەنگێکی گڕو بە دڵیپڕەوە •

کوتی : سوپای مەغۆل هێشتا لەکوشتنو بڕینی خەلکیو وێرانکردنی شاری [ هەرات ] نەبووبوونەوەو جێـــان نەهێشتبوو ، بەشێکی تریان لـە شارەکانی ترا قەسابخانەیان دانابوو •• ئەوانەی لەم شاری [ هەرات ]ەدا مابوونەوە ، ئەوانە بوون کـــە لەپەناگاکاندا خـــۆیان شاردبۆوە ••

بەڵام ئەوانەی کەلەدەست مردنی حەتمی ڕزگاریان بووبوو ، وەنەبێ لەدەست ئێشو ئازاری گەزندەی خەمو خەفەت قوتار بووبن !! کاتێ کە بەناو شارا گەڕان تەنیـا

ماڵی ویرانکـــراو وژنی سڵـهەڵدڕاوو منداڵو پیـــاوی سەربڕاوی مەڵۆکراویان دی !! نە تەماشای خۆیشیان دەکرد ژمارەیان لە چل کەس تێناپەڕێ !!

لێیان حاڵی بوو ئەو شارەی کە ژماردی دانیشتوانی سەدو پەنجا هەزار کەس بوو ، تەنیا ئەم چل کەسەی لێدەرچووە !! نەوەنەبێ کـــە بگرین بەسەر کەلاوەی شارەکەیاناو ئەو هەموو مرۆڤە سەربڕاوو کوژراوانەدا ، هیچی تریان لـــە دەست نەمات !! چونکە ترسو بیم هەموو دەرێکی دەروونیانی داگیرکردبوو !!

مامۆستاو هاوەڵەکانی بەجارێ دەستیان کردەگریان، لەتکەوتنۆکێ فرمێسکی سەرگونای ئەوانـەوە ، هەستت بەوە دەکرد کە ڕقوکینە دڵی گمتوون !! بەڵکو ئەوەت دەبینی لـــەقـــوولایی دڵیـــانا ئارەزووی فـــراوانی تۆڵەسەندنەوەیان لـــەجمو جوڵدایەو بـــەڵام ڕێگـــەی دەرچوونی نی‌یـــە !! چونکە هەموویان دەیانزانی کاری تۆڵەسەندنەوە لەم کاتەدا بێسوودو بێهوودەیە ..

یەکێك لە قوتابیەکان گوتی : مامۆستاگیان ، بۆچی

ئەوەمان لەیادچووە چی کرا بەشارەکەی خۆمان ، شاری [ بوخارا ] ؟ ئەو شارەی کە بەدرێژایی ڕۆژگار جێگای زانایان و لەخواترسان بوو !؟. ئێمە باش بۆیان گێڕاوینەوە کە مەغـۆل مزگەوتەکانیان کـردین بەتـەویلەی وڵاخەکانیان وقورئانەکانیان دڕاندین و خستیانە ژێرپێی وڵاخـەکانیـانەوە .. وە شـارەکەیـان لەگـەڵ خاکا یەکسان کردین !!

یەکێکی تریان کە فرمێسك لەچاویا قەتیس بووبوو، بـە هەنسکدانەوە دەستی بەقسەکردو گوتی : وەنەبێ شارەکانی تر لە شارەکەی ئێمـە باشتر بووبن .. بۆچ لەیادمان چووەتەوە کـە چیان کرد بـە [ بەڵخ ] و [ سەمەرقەند ]و شارەگەورەکانی تر کە قیبلەی زانست و زانیاری بوون ، وە لەهـەموو لایەکەوە بۆ فێربوونی زانیاری خەڵکی پۆل ، پۆل ڕووی تێدەکردن ؟؟

مامۆستاو قوتابیـەکانی هاوەڵی ماوەیەك ماتەمینی و بێدەنگی ڕوویان تێکردن .. بەڵام دڵ و دەروونیان وەك سەماوەر بە ڕق و کینە هاتبوە جۆش ، لەم کاتەدا مامۆستا

ری دەروونی ئەوانی بەخەفەت بڵێسەدار تر کــردو
وتی :

[ ئیمام فەخرەدین ] بــە نووسراوەکەی خــۆی
توانیویەتی دیمەنی دڵتەزێنی شاری بەغدامان پیشان بدات
.. لەگــەڵ ئەوەشدا کــە نەیتوانیوە هەموو شــتێك
بنووسێ ، چونکە لەژێر دەسەلاتی زەبرو زۆری دەوڵەتی
مەغــۆلدا بووە ، بــەم چــەند ووشەیە ڕووداوەکە
باس دەکات و دەڵێ : « کوشــتارێــکی فــراوان ، تالان و
بڕۆیەکی زۆر ، ئەتك کردنێکی بێداد ، کورتەیــەکی
بیستنەکەی دڵتەزێنە ، دەبێ باسکردنی بەدرێژی چۆن
بێت ؟ » ..

قوتابییەك کــە کردەوەکانی مەغۆل دڵ بریندار ی
کردبوو ، هەستایە سەرپێ و بەدرێژی باسی کاول کردنی
بەغدای کردو گوتی : « چل ڕۆژ شمشێری مەغۆل لە
دروێنەی گەردنی دانیشتوانی شاری بەغــدادا بوو ..
لەم ماوەیەدا چی بەردەست کەوت تالان کرا .. زانایانی
زۆریان لــە ناوبرد .. هــەڵگری قورئان و پێش نوێژی

زۆریان کوشت •• مزگەوتو قوتابخانەکان نوێژگەرو قوتابییان نەما •• شارەکە بووە کەلاوەیەکی پانوبۆڕ •• کەسی تیانەما هەندێکی کەم لاژگ و گەلۆر نەبێ » •

قوتابییەکە بەردەوامبوو لەسەر باسەکەو گوتی :
« کوژراو لەرێگاو باندا مەلۆکرابوون •• کاتێ جاڕدرا : ئیتر کەس ناکوژرێ مەترسن بێنە دەرەوە •• ئەوەی لەناو گژوگیاو بیرو گۆڕستانو ژێرزەمینو پەناگاکاندا هاتنەدەرەوە •• دەتگوت مردووی گۆڕستانن و گۆڕەوشاردراون ، برابرای لێ تێك دەچوو •• زۆریان یەکتریان نەدەناسییەوە •• ئینجا نەخۆشی بەکەرەنتو کەوتە دروێنە •• هەوای ناوشار گۆڕا •• درمو پەتا بلاوبوونەوە تاكتاکەیەکیش لەم دروێنەیە ڕزگاری بوو !! » •

ماتەمینیو بێدەنگی کۆڕەکەی داگرت •• مامۆستا سەری بەرز کردەوەو گوتی : برایان ، ڕووباری دیجلە کە هەزارەها میل لەئێمەوە دوورە ، وەك ئەوە ئێستاش

سین وشەیۆرکات بۆشاری بەغداو دانیشتوانیو بەبالای
ـەو هەموو زانستگاو زانیاری یەدا بخوێنێ کە لەکیسی
مرۆڤایەتی چوو !! ئەو ڕووبارە ماوەی چەند ڕۆژێك بە
مەرەکەبی کتێب ڕەش بوو   وەك ئەوە لە پرسەدابێو
بەرگی ڕەشی پۆشیبێ بۆ ئەو هەموو کتێبە زانیاری یانەی
دران بەدەم ئاوەوەو ، مرۆڤایەتی لێیان بێبەش بوو !!
ئینجا مامۆستا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو گوتی:
ئەو مێژوونووسەی مێژووی ڕووداوی جیهانی ئیسلامی
دەنووسـێتەوە ، ڕەنجێکی زۆر دەکێشیو ئازاری باش
دەچێژێ ، لەکاتێکا ئەو نەگبەتی یە گەورانە تۆماردەکات،
کـە بەسـەر خەڵکی موسڵمانو وولاتە ئیسلامی یەکاندا
هاتوون .. گەر ئارەزووتان لێیە گوێ لـە [ یاقووتی
حەمەوی ] بگرن ، چۆن خەمو پەژارەی زۆری خـۆی
بەرامبەر بەو نەگبەتی یە دەردەبڕێ ؟ کاتێ کـە شاری
ئاوەدان بە کتێبخانەی [ مەرو ]ی جێهێشتووەو دەڵێ :
« انا لله وانا الیه راجعون » بۆ ئـەو ڕووداوەی کـە
پشت شکێنەرو تەمەن تێکدەرو قوڵ ووردکەرو سـام!

پیر کەرو کاکڵەی دڵڕفێنەرو دەروون ڕەشکەرو جەرگ سووتێنەر بوو !! » .

ئەمە قسەی یەکێکە کە بەچاوی خۆی دیویەتیو لەشاری [ مەرو ] هەڵهاتووە بۆشاری [ موصڵ ]و لەوێ خۆی گرتۆتەوە ، گوێی بۆگرن بزانن چـۆن باسی خۆیتان بۆ دەگێڕێتەوە ؟! کە دەڵێ :

« .. ئیتر لەوکاتەدا پاشاکان پاشەوپاش هەڵهاتن بەشەو دەڕۆیشتن ، تا بگەنە شوێنێك دڵئۆقرەی تیـا بگـریو پشوبدەن ، هێمنیو ئاسایشی لەدەستچوو بەدەست بێنن .. ها لێرەو لـەوێ تاگەیشتن .. پاش ڕەنجو ژانێکی زۆر لەشـاری [ موصـڵ ] خـۆیان گرتەوە .. »

مامۆسـتا [ جمال‌الدین ] درێژەیدا بەباسـەکەو ڕووی کردە هاوەڵە خەفەتبارەکانیو گـوتی : لـەم سەرزەوی‌یەدا هیچ کەسێك نیە ئـەم ڕووداوە سامناكو دڵتەزێنەرە ببیستێو لەداخا مووی لەشی وەك نەشـتەر

ڕاست نەبێتەوەو پێستی لەشی گرژ نەبێت !!

زانای مێژوونووسی بــە ناوبانگ [ ابن الاثیر ]
هــەمان حاڵەتی تووش‌بووە کــە باسی ئــەو هێرشە دڕوندانەیەی مەغۆلی کردوە •• بۆیە گوتویەتی :

« چەندساڵێك پشتم‌کردە نووسین‌و باس‌کــردنی ئــەم ڕووداوە ، چونکە ئەوەندە لام‌گەورەبوو ، ئازارم دەچەشت ، ڕقم لــە باس‌کردنی بوو ، دوودڵ بووم •• باســی‌بکــەم؟ باســی‌نــەکــەم ؟ ناهــەقــم نــەبــوو ، کێ دەتوانێ کۆس‌کــەوتنی موسڵمانان بنووسێت ؟ کێ ئەو باســەی لائاسانە ؟ خۆزگا دایکم منی نەبوایە ! هەروەك حەزرەتی مریەم فەرمووی : [ « خۆزگا پێش ئەم ڕووداوە بمردمایەو لە بیربچوومایەو لەیادی کەسدا نــەمامایە » ] خــۆ وەڵلاهی ئــەو ڕووداوە ، ئــەوەندە ناهەموارو بەڵایەکی ئەوەندە گەورەبوو ، نــە شــەوگار شــتی‌وای بەخــۆیەوە دیوە ، نەڕۆژگــار !! ئێش‌و ئازارەکەی بۆ هەموو کەس‌بوو بەتایبەت بۆ موسڵمانان !! هــەرکەس بڵێت : لەو ڕۆژەوە خــوا ئادەمیزادی

دروست کردووە تائەمڕۆ ، مرۆڤایەتی بەڵای وای تووش نەهاتووە ڕاست دەکات •• لە هیچ کتێبێکی مێژووودا ، نەك ڕووداوی وا بەڵکو نزیك لەم ڕووداوەشی تیا تۆمار نەکراوە •• گەورەترین ڕووداو کە باس کرابێت ، ئەوەیە : کە [ بەختەنەصر = بخت النصر ] بەنی ئیسرائیلی یەکانی زۆر کوشتووەو شاری ئۆرشەلیمی وێران کردووە •• بەڵام کوژراوی موسڵمانان لەهەر شارێکدا بەدەستی مەغۆل بەقەد ژمارەی هەموو بەنی ئیسرائیلی یەکان بووە ، وە تەنیا شارێکی موسڵمانان کە ئەو لەعنەتیانە وێرانیان کرد چەند ئەوەندەی شاری [ ئۆرشەلیم = بەیتول مەقدیس = بیت المقدس ] بووە !! هیوام وایە هەتاهەتایە ئادەمیزاد وێنەی ئەم ڕووداوە بەخۆیەوە نەبینێ •• »

مامۆستا بە بیری تیژی خۆی هەستی کرد کە چەند پرسیارێك دێت بەدڵی هاوەڵە کانیا ، بۆیە گوتی : بەڵێ برایان ، ئێمە ناتوانین بەشێوەی بەکارهێنانی چەك بەگژی ئەو سەرپا زۆرو فراوانەدا بچین •• بگرە بەخەیاڵیش ئەو

کارەمان بۆ ئەنجام نادرێت ، بەڵام ئێمە دەتوانین کارێك ئەنجام بدەین ، کە سوپای گەورەی عەباسی بۆی نەکرا .. ئەگـــەر ئێمـــە بەژیری‌و هۆشیاری‌یەوە بجولێینەوە ؛ چەکێکمان پێـــە باشترین چەکەو لە ناهەموارترین کاتا فریامان دەکەوێت ، ئەویش تەنیا چەکی بیروباوەڕە !!

کۆمەڵە قوتابیەکە واقیان وڕما لـــەم قســـەیەی مامۆستاە چونکە وڵاتی خۆیان‌و وڵاتی دراوسێکانیان کە وێران‌و کاول کرا ، وە ئەو هەموو خەڵکەی کە کوژراو ئاوارەکرا ، وڵاتی موسڵمانان بوو .. وە ئەو خەڵکەش موسڵمان بوون !!

بۆیە مامۆستا بەشوێن قسەکەیا ڕۆیشت‌و گوتی :
برایان ، واقتان وڕنەمێنێ لە قسەکانم .. چونکە دەزانم دەڵێمچی ؟! من دەتوانم دڵنیاتان بکەم : هەرچەند مەغۆل موسڵمانانیان تێکشکان بەڵام ناتوانن هــەرگیز ئیســـلام تێکشکێنن .. هەرچەند توانیان مزگەوتەکان بڕوخێنن‌و ئەوەی مایەوە بیکەنە تـــەویلە ، هەرچەند شەل‌و کوێرم

ناپارێزم پەنایان بردەبەر کوشتن‌و بڕین ، هەرچەند توانیان کڕی بڵێسەی ئیسلام کزبکەن ، بەڵام نەیانتوانی‌و هیچ‌هێزێك نیە بتوانێ بەتەواوی پیکوژێنیتەوەو لەناوی ببات ..

ئەگەر مەغۆلەکان توانیان سەرکەون و شارەکان بگرن ، هۆی ئەوە بوو موسڵمانەکان موسڵمانی ڕاستەقینە نەبوون .. چونکە ئەگەر هەڵس‌و کەوتیان بە پێی ئیسلام بوایە خۆیان ئامادەدەکردو پێش ئەوەی ئەوان هێرش بێنن ئەمان هێرشیان دەبردە سەریان ، ئەوکاتە خەیاڵی سەرکەشی‌یان لە دڵا دەردەکردن .. زیادلەوە لە بارەی ئیسلامیشەوە شارەزایان دەکردن ..

مامۆستا سەرێکی‌باداو لە قووڵایی هەناویەوە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا کە پڕبوو لە تاڵاوی ناو دەروونی‌و گوتی : هەموو یەکێك لەئێوە بیستویەتی‌و دەزانێت موسڵمانانی ئەو سەردەمە ، چۆن خوویان دابووە هەواو هەوەس‌و ڕابواردن‌و باوەش‌کردن بەدنیادا !! ئایا ئیسلام بەوە ڕازی‌یە ؟

ئەوە بزانن هەر میللەتێك ڕقی بێت لە مردن لە پێناوی حواداو بەخەیاڵی خۆی بۆ کەمێـــك ڕابواردن ، زیانی دنیـای پـێ خۆشـبێت ، ئـەوە ئەگـەر بمێنێت ، دەبـێ ڕابواردنەکەی لەکیس بچێتو بەسەرشۆڕیو ڕسـوایش بژی ، هەروەك واقیع پیشانی داین ..

ئێمە دەتوانین بڵێین : ڕوخانی پاشا « خەلیفە »ی عەباسی لەبەغدا ڕوخانی ئیسلامە ؟ خۆ هەموو دەزانین کاتێ مەغۆل دەوری بەغدای دا ، پاشای بەناو خەلیفـــە لەکۆڕی بەزمو ڕەزمو ڕابواردنا بوو هیچ گوێی پێ نـەدا تا گۆرانی بێژەکەی بەردەمی تیرێکی بەرکەوتو کوژرا !!

یەکێك لە قوتابیان بەداخو خەفەتەوە گوتی : خوا کە ویستی تەزاو قەدەری خۆی بێنێتە دی ، هۆشیاران بێ هـۆش دەبن .. ئەگینـــا مرۆڤ شتی وا دەبیســـتێ هەرناتوانێ باوەڕبکات .. لە مامۆستایەکم بیست دەیگوت: « تەتارەکان گەمارۆی کۆشکی « خەلیفە ! » یان دابوو ، لە هەموو لایەکەوە تیرەبارانیان دەکرد .. تا کەنیزەکێك

کـــە لەبەردەم « خەلیفە ! »دا یاری دەکـردو دەیهێنایە پێکــەنین ، کوژراو تیـرێك لەپەنجەرەوە هــات‌و دای لەسەردلی » !! ••

مامۆستا بەدەنگێکی پڕ لەداخ‌و خەفەتەوە گوتی : ئەگەر ماوە بدرایە بەموسڵمانان بەویستی خۆیان پێشەوا هەڵبژێرن ، بەوجۆرەی کەویستی ئیســلامە ، ئاوایان لێ نەدەقــەوما !! وسەرکردەو پێشەوایەکیان هەڵدەبژارد وەك [ مظفر قطز ] لێ‌هاتوو بێ‌و دەست بــە ئیسلامەوە گربێ‌و لەداستانی « ملحمة » [ عەین‌جالوت ]دا دوژمن شکێن بێ ••

برایان ، ئــەو مەغۆلانەی کــەووڵاتی ئێمەیان داگیرکرد ، بەهۆی باوەڕی پتەوی چــەند زانایــەکی لەخـــوا ترسەوە توانرا دڵ‌و دەرونیان داگیر بکـرێ‌و لەعەقیدەی بت‌پەرستی پاك بکرێتەوەو لەجێگەیا عەقیدەی ئیسلامی بنێژرێ •• پۆل‌پۆل موســڵمان‌بوون‌و ســەریان بۆئیسلام دانەواند ، پاش ئەوەی کەسەرزەوی ســەری بۆدانەواندن‌و بەسەر هەمووکۆشێکدا زاڵ‌بوون ••

ئەگەر ئێمە بەهۆی ئیسلامەوە ، لەوولاتی خۆماندا بەسەر مەغۆلدا زاڵبووین‌و سەرکەوتین ، ئەوا ئەمڕۆ دەچینە ناو جەرگەی خاکیانەوەو لەگەڵیانا دەجەنگین ، نەك بەچەك بەڵکو بەعەقیدەو بیروباوەڕ !!

بێگومان لەم بارەوە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی سەروماڵیان لەپێناوی خـودا بەخت‌کردووە ، پێشـمان کەوتوون‌و داوای موسڵمان بوونیان لێکردوون .. بەڵام ئەو سەرکەوتنە پێویستەیان دەستگیر نەبووە ..

مامۆستا ماوەیەك بێدەنگ بوو ..

قوتابیانی هاوەڵی بوارێکی گونجاویان بۆ هەڵکەوت، تاهەندێك لەو پرسیارە زۆرانە دەربڕن کـە دێت بۆ مێشکیان ، لە بارەی سوودی ئەم بانگەوازە لەسەرخۆیەی کە مامۆستا دەیەوێت ئەنجامی بدات .. خۆ ئەم بانگەوازە بەم شێوەیە چەند جارێك ڕووی داوەو جار لەدوای جار سەرنەکەوتووە .. بۆیە یەکێکیان گوتی :

بێگومان هەندێ لەپاشاکانی وولاتی [ جەغتـای ] لە

ئاسیای ناوەڕاستا موسڵمان بوون ـ ئەو وولآتەی کەئیمە ڕوی تێدەکەین ـ بەڵام موسڵمان بوونیان هیچ سوودێکی نەبوو •• ئەوەبوو [ بەرەکەخان ] کـە دایـکی بەشیری ئیســـــلام گۆشی کردبوو ، زۆری نەخایاند لەپاشایەتی لایانبرد •• وە هەروەهـــا [ بۆراق خان ]یش کـــە لەدواڕۆژەکانی تەمەنیا موسڵمانبوو •• لەنـاو مەغۆلـدا موسڵمان بوونەکەی شوێنەوارێکی وای نەبوو •• بگرە کەخۆیشی مرد بەپێی یاسای ئیسلام نـەنرایە گۆڕ •• بەڵکو بەپێی نەرێتی بتپەرستی خۆیان ناشتیان •• وە ئەو ژمارە کەمەش کەلە گەڵ خۆیا موسڵمان بووبوون پاش مردنی ئـەو لە ئاینیئیسلام هەڵگەڕانەوەو بوونەوە بـە بتپەرست !!

وە هەروەها [ تەرماشین ] کە هەوڵێکی زۆریدا بۆ بلآوکردنەوەی ئیسلام لەناو خزمەکانی خـۆیا ، زۆری نەخایاند لەســـەر تەختی شاهی هێنایانە خوارەوە •• موسڵمانەکانیش بەدەستی [ بۆزان ] بە خراپترین شێوە چەوسێترانەوە !!

لەگەڵ ئەوەدا کە وولاتی [ جەغتای ] پارچـــە ، پارچـــە بووەو بووەتە چەند وولاتێك و گـــەورەترین پارچەیان وولاتی [ کاشغەر ]ە ، تا ئێستاش موسڵمانانی تیا دەچەوسێنرێتەوە !!

ئـــەم قوتابییە تەنیا بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە ، بۆ ئەوەی بەتەواوی مەبەستەکەی ڕوون بکاتەوە ..

مامۆســـتا بەئەنقـــەس بێدەنگ بوو ، تاماوەی هاوەڵەکانی بدات ڕای خۆیان دەربڕن لـــەبارەی ئـــەم هەنگاوەی کە دەیانەوێ بینێن ، قسەکانی ئەم قوتابییەی بێ ڕاست بوو .. لـــەوانەیە ئـــەوانی تریش شـــتی وا بێ ئەخەیاڵیاناو بەڵام شەرم نەیەڵێت دەری بڕن .. بۆیـــە ـــە پێویستی زانی بۆیان ڕوون بکـــاتەوەو پێیان بڵێ : ئینشائەڵڵا ئێمە لـــەو هەڵانە خۆمان دەپارێزین ، کـــە ئەوانەی پێش ئێمە تووشی هاتوون ، بەڵکو بەیارمەتی خوا دەوانین ئـــەرکی سەرشانمان بـــەپێی خوازی خـــۆمان بەجێ بێنین ..

ئینجا گوتی : زۆر بەووردی لە مۆی سەرنەکەوتنی ئەوان کۆڵیومەتەوە .. گەیشتوومەتە ئەم ئەنجامە : ئەو پاشایانە کە موسڵمان بوونو سەرنەکەوتوون ، تەنیا خۆیان موسڵمانبوون و وەزیـرانو فـەرماندە سـوپاییەکانیان موسڵمان نەبوون ، لەبەرئەوە لە کاتی تەنگانەدا یارمەتییان نـەداوون ..

لەبەرئەوە ئێمە لـەم سەفەرەدا تابتوانین پەیوەندی دەکـەین بەئەمیرو فەرماندەکانی سوپاوە ، پێش ئـەوەی پەیوەندیبکەین بە پاشاوە ، ئەگەر وامانکرد کارەکەمان بۆئاسان دەبێت .. ئینشائەڵلا ..

برایان ، بۆیە ئەم هەڵوێستەیەمان کرد تا بەمجۆرەی کە بۆمباسکردن لێتان ڕوونبێت ، ئەم کارەی ئێمـــە کارێکی ئاساننییە ، وە ئەوەش بزانن کە دەچین بـۆ [ کاشغەر ] دەچین بۆناو چ میللەتێك ؟!

قوتابیانیهاوەڵی هەموو بەجارێك گوتیان : ئێمـــە پەیمانمانداوە سەروماڵمان لە پێناوی خوادا بەخت کەین ، وە ئەگەر پرسیارێکیشمان کردبێ ، هـــۆی ئەوەبووە

...ترین ڕێگە هەڵبژێرین بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکەمان ..
مامۆستاش هەندی دوعای خێری بۆکردن و گوتی :
...رایان ، دەبێ لەهیممەتی بەرزی خۆتان یارمەتی
وەربگرن بۆ ڕۆچوون لەم کارە گرنگ و گرانەدا ، مادام
لەڕێگەی خوادا بێ لە هیچ شتێ مەترسن ، پێشەواتان
هەمیشە دڵسۆزی بێت بۆ خوا .. چونکە دڵسۆزی
لەهەرکارێکا بێت ئاسانی دەکات ..
لەهەموو بارودۆخێکدا یادی خواتان لەبیر نەچێت ..
وەک ئەو خاوەن باوەڕانە بن کە خوا لەبارەیانەوە
دەفەرموێ : « رجال لا تلهيهم تجارة ولا بيع عن ذكر
الله » النور/٣٧ واتە : ئەو خاوەن باوەرانە پیاوانێکن
بازرگانی و کڕین و فرۆشتن یادی خوایان لەبیر نابانەوە ..
هەمیشە چاودێری دڵتان بکەن ، واهەست بکەن
لەهەرکوێ بن خواتان لەگەڵەو چاودێرتانە « ونحن
أقرب اليه من حبل الوريد » ق/١٦ خوا دەفەرموێ :
... لەڕەگی پناگوێ لێی نزیکترین ..
لەهەموو کردەوەیەکتانا درووشمتان ئەمە بێ

« خوایە ، تۆمان مەبەستەو ڕەزامەندی تۆمان دەوێ » ..
لەسەر بەرەکەتی خوا ، با ڕێکەوین ..

مامۆستا جمال‌الدین لەگەڵ هاوەڵەکانیا سواروولاخەکانیان بوون‌و ئاوزەنگیان‌لێدا .. بەدەشت‌و دۆڵ‌و شیوو نشێوو شاخ‌و لاپاڵدا دەڕۆیشتن ، بەرەو [ کاشغەر ] ڕێیان گرتەبەر ..

بۆڕەزامەندی‌خوا پێش‌بڕکێیان دەکرد .. ئالەم‌حاڵەتەشدا قوتابیان ئەدەبیان بەکاردەهێنا .. ئەگەر یەکێکیان بەهۆی وولاخەکەیەوە پێش مامۆستای بکەوتایە ، گورج لغاوەکەی توندەکردو نەیدەویست لەمامۆستای پێشکەوێت !!

چەندڕۆژێك بەردەوام چۆڵ‌و بیابان‌و دۆڵ‌و شاخیان بڕی وەك‌ئەوە لەگەڵ کاتدا پێش‌بڕکێ بکەن .. چونکە موسڵمان‌لەژیانیا ، نابێ هیچ‌هەلێك لەکیس‌بدات..

# بەرەو دەرگاکانی شاری کاشغەر

لەگەڵ زەردە پەڕی ڕۆژی نۆزدەهەمدا گەیشتنە دەوروبەری شاری [ کاشغەر ] لــەو ناوملانەوە شاریان لێدەرکەوت ..

زۆرشادمان بوون‌و لەخۆشــیدا گەش‌بوونەوە .. چونکە ماوەیەکی زۆرە بەڕێگەوەن .. واێستاش کاتی ئەوە هـــاتووە خۆیان‌و وولاخــەکانیان پشووبدەن تا ماندوویان بحەسێتەوە .. بـــەلام چاوەڕوانی فـەرمانی مامۆستان تابزانن چ فەرمانێك دەدات ، چوونە ناوشار یا نەبوودان ؟

مامۆستا گوتی : برایان ، ئەوا دەروازەکانی شارمان لێدەرکەوت ، ئەمەوی ئەم شەو لەناوشار پشووبدەین ، بەلام پێش ئـــەوەی برۆین پێویستە پێتان بلێم : ئەمڕۆ ئێمە لەناو خاکی کافرو بت‌پەرستە کانداین‌و ئەمانەیش ڕەحم‌و بەزەیی لەدڵیانا نی‌یە !! واقیعی ئەم شارەی کـە

بەرەوڕووی دەچین باشــترین بەڵگــــەیە بۆ ڕاستی قسەکانم ..

یەکێك لەهاوەڵەکانی گوتی : بەڵێ مامۆستاگیان ، ئەو موسڵمانانەی کە لەپێش ئێمەدا هاتوونو ویستوویانە خەڵکی ئــــەم وولاتە ڕێنموونی بکەن بۆ ئیسلامو ڕێی ڕاستیان پیشان بدەن ، زۆر بوون .. بـــەلام کوشتنو ئازاردانو ئاوارەکردن چارەنووسی خۆیانو ئــەوانەش بووە کە موسڵمان بوو بوون !!

هاوەڵێکی تریان ویستی قسەی هاوەڵەکەی ڕوون بکاتەوە لەبارەی حاڵی موسڵمانانی ئەم وولاتەوە بۆیـــە گوتی : ئەوەی [ جەنگیزخان ] کردی بە موسڵمانانو ئیسلام دۆستان هەرگیز لەیادمان دەچێتەوە ؟!

ئەم جەنگیزخانە یاسایەکی کۆمەلایەتی دانا بـــۆ وولاتەکەی بەناوی « ئەلیساق » ئەمەش بڕگەیەکی ئەو دەستوورەیە « .. هـــەرکەس بەشێوەی موســڵمانان ئاژەڵێ سەربڕێ ، سەر دەبڕڕێ » .

وه هەروەها « جەغتای » بناغــــە دانەری شانشین « مملکة »ی جەغتای چەندەها یاسای تۆقاندن‌و توندی دانا بۆ لەناوبردنی ئیسلام لــــە وولاتەکەیدا •• ئـەوەندە دوژمنی ئیســـلام بوو نەیدەویست کەس لەڕوویا ناوی ووشەی « ئیسلام یا موسلمانان » بیات مەگەر بۆ شکاندن‌و سووك بوونی نەبێ !!

مامۆستا « جمال‌الدین » کە سەرنجی هاوەڵەکانی‌دا، لــــە ناوچاویانا خەم‌و خەفەتێکی زۆری بەدی کــــرد ، هەستی‌کرد ڕەش‌بینی دەیەوێت سەرکێشی بۆ دڵە پڕ لە باوەڕەکانیان ، بە پێویستی زانی وورەیان بەرز بکاتەوەو ئامادەیانکات بۆ بەرەوڕوو بوون لەگەڵ واقیعێکی دژوارو ناهەموارا •• بۆیە پاش ماوەیەك بێدەنگی گوتی :

دەگێرنــــەوە « پێشەوایەکی موســـڵمان بـەناوی ( نورالدین‌ی خوارەزمی ) لەو شارەدا بووە •• هەندێ لـــە بت‌پەرستەکان‌و پێشـــەوایانی بوذی‌و قەشـــەی مەسیحی‌یەکان دەستەوداوێنی « کیوك‌خان »ی پاشـــای وولات دەبن •• کـــە ئـەو پێشـــەوا موسڵمانەیان بـۆ

بانگ‌بکات‌و له گۆڕەپانی شاردا کۆڕێکیان بۆ سازبدات تا دەمەقاڵە « موناقەشە »ی لەگەڵ کەن لەبارەی ئاینی ئیسلامەوە ، و داوای لێبکەن ئەگەر ئاینی ئیسلام لەهەموو ئاینێك چاترە ، پێیان بسەلمێنێ .. دەنا چارەنووسی کوشتن دەبێت ..

بەفەرمانی پاشا کۆڕەکە سازدەکرێت ، خەڵکێکی زۆر گرد دەبێتەوە ، مامۆستای موسڵمان‌و پێشەوای مەسیحی‌و یوذی‌و بت‌پەرستەکان ئامادە بووبوون .. لەبارەی پێغەمبەریەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم‌و ئاینی ئیسلامەوە باسەکە دامەزرا .. مامۆستای موسڵمان بەڵگەکانی بەهێزو مەنطیقی بوون .. ئەوانیش بەڵگەکانیان بێ‌هێزو پێزبوو ، وەك دەڵێن : بۆڕی‌دان‌و دەم‌کوتی کردن ..

لەسەر لایەڕەی تەگبیرە چەپەڵەکەیان پلانێکیان کێشابوو کەپڕبوو لەستەم‌و داخ‌لەدڵی .. بڕیاریان دابوو پاش تێشکانی ئەنجامی‌دەن .. پلانەکەش بەم جۆرە بوو :

داوایان کرد لەپاشا فەرمان بدات کە مامۆستاو

ـاوەڵە موسڵمانەکانی بەپێی شەریعەتی ئیسلامی دوو
وجدە ببەن ..

کاتێ مامۆستاو هاو ئاینەکانی سەریان نایە سـەر
دوی بۆخـوا ، هـەندێ هـەوزەیان گاڵدا ئازاری
موسڵمانەکان بدەن !! ئەوانیش سەریان دەگرتن‌و توند
دەیانکێشـا بەزەویدا ، چـەند تاوانێکی ناشـیرین‌و
بێشەرمانەی تریشیان کرد لەگەڵیانا !!

مامۆستا نوێژەکەی نەبڕی کـە لـە نوێژەکەی
بوودوە ڕووی‌کردە ئاسمان‌و گوتی : « ادعـوا ربکـم
تضـرعا وخفیة انه لا یحب المعتـدین » الاعراف/٥٥
واتـە : بـەنهێنی‌و بەلالانەوە لەخوای پەروەردگارتان
بپاڕێنەوە ، بێگومان خـوا ئەوانەی خۆش‌ناوێت کـە
دەست‌درێژی دەکەن ..

بێ ئەوەی مامۆستا بیکات بەگاڵە داوای لەپاشاکرد
ڕێی بدات بگەڕێتەوە بۆ ماڵ .. ئەویش ڕێی‌داو لەگەڵ
هاوەڵەکانیا کۆڕیان جێ‌هێشت » .

مامۆستا لەسەرخۆ بە هاوەڵەکانی گوت : ڕۆڵەکانم ، دیتـــان ئەمانە تا چ ڕاددەیەك دوژمنایەتی یان بەهێزەو ڕقیانە لـــەم ئاینە پاکە ؟ دیتان بانگەوازی ئەو پێشـــەوا موسڵمانە بۆ ڕێگەی ڕاستی خوا چەند هۆشیارانەبوو ؟! پاش ئەوکردەوە ناڕەوایەی نەیارەکانی ، ووشـــەیەکی ناڕەواو ناشیرین نەهات بەدەمیدا .. جا ئێوەش دەبێت خۆتان ئامادەکەن وە ئـــەم جۆرە ئازاردانـەتان لەپێش چاوبێت ..

یەکێك لەقوتابی یەکان بەوپەڕی ئەدەبەوە گوتی :
**مامۆستا ، بەم پێیەی کەجەنابت باسی ئەو مامۆستایەت کرد** دەبێ ئێمەش ملکەچو سەر شۆڕبین لەبەردست ئـەو بتپەرستانەدا !! وە ئەمەش پێچەوانەی ئەو هێڵە ڕاستەیە کە قورئانی پیرۆز بۆ موسڵمانانی کێشاوە .. ئـــەوەتە قورئان دەفەرموێ : « ... وللە العــــزة ولرســـوله وللمؤمنين .. » ٨/٦٣ هەروەك جـــەنابت دەزانیت : سەربەرزی ، هەر بۆخواو پێغەمبەرو خاوەن باوەڕانە ..

ئەگەر سەنجی هەڵوێستی ئەوزانایە بدەین کەی ئەوعیزەتو سەربەرزی‌یە دەبینین کە خوا بۆ موسڵمانانی داناوە ؟!

گرنگترینو گەورەترین شت لای ئادەمیزاد ژیانیەتی ، بەڵام لای موسڵمان بچوکترین شتە کە بەختی‌بکا لەپێناوی خوادا ، ئیتر لەهەڵویستی وادا بۆچ ددبێت سەرشۆڕی قبووڵ بکات ؟!

مامۆستا بەسنگێکی فراوانەوە کەنیشانەی ئاگاداری ئەواو بوو ، وەڵامی قوتابی‌یەکەی دایەوەو گوتی :

وەنەبێ تەنیا ئاگادار بوون لەحوکمی شەرعی پێویست بێت .. بەڵکو ئەوەی گرنگ‌بێت ئەوەیە بزانین ئەو حوکمە شەرعی‌یە بۆ چ کاتو سەردەمێك دەگونجێت ؟!

کاتێ کەمن داواتان لێ‌دەکەم زبری مەنوێننو پەنا بۆ نەرمو نیانی‌و لەسەر خۆیی بەرنو وازبێنن لەبەرەنگاری دوژمن ، دەزانم کە هێزو کەرەسەی بەرەنگاریتان نی‌یە ..

ئایا ئێوە بەژمارەیەکی کـــەمی چەند کەسی‌یەوە دەتوانن چی بکەن ؟ تەنیا ئەوە نەبێ خۆتان بەکوشـــت بدەن •• ئیسلام کاتێ دەیەوێت خۆتان بەکوشت بدەن کە سوودی هەبێت •• بەڵام لەکاتی وادا هیچ سوودێکی نی‌یە تەنیا زیان نەبێت ••

ئینجا ، ئایا دەتوانین بڵێین : پێغەمبـــەر صلی اللە علیە وسلم بێ ئاگابووە لـــەو عیزەت‌و سەربەرزی‌یەی کەخوا بۆی داناوە ؟ لەگەڵ ئەوەدا کەلە تایف « طائف » گەڕایەوە داوای لەچەند بت‌پەرستێك کـــرد کەپەنای بدەن ، لەوانە تەنیا موتعیمی کوڕی عەدی « مطعم ابن عدی » کە بت‌پەرست بوو پەنای‌دا ••

ئازیزەکانم ، پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم بێ‌ئاگا نەبووە لەو عیزەتەی کەخوا بۆی داناوە ، بەڵکو ئەمە خۆی عیزەت‌و سەربەرزی‌یە ، لەم کاتەداو لەم هەڵوێستە ناهەموارەدا ، کە هیچ هێزو دەسەڵاتێکی نی‌یە ، خۆی نەخاتە بەردەست تۆڵە سەندنەوەی قوڕەیش •• هەروەك دەڵێن : بۆ هەر سەردەمێك‌و کاتێك ڕا یەك هەیەو بۆ

مەرجێگایەك حوكمێ •• خۆ هەموو لێمان ڕوونە ئـەو بـارو دۆخـەی کـە پێغەمبـەری ناچـار کرد قایل بێ بەمەرجە ناهەموارەکان لەپەیمانی « حودیبیـــە »دا کاتێکی تایبەت بوو •• بـــەڵام لەکـــاتی ڕزگار کردنی مەککەدا بەدەیەکی ئەو مەرجانە قایل دەبوو ؟!

هەموو گوتیان : نەوەڵڵا •• بەڕاستی پێویستمان بە ڕێنموونی‌یەکانی جەنابت هەیە ••

پاش ئـــەم قسانە مامۆستا چاوێکی گێڕا بەڕووی قوتابیەکانی هاوەڵی‌دا تابزانیت نیشانەی پرسیار بـــەدی دەکات ؟ ئینجا ویستی مەبەستەکەی تەواوکاتو گوتی :

قۆناغی بانگەوازی ئیسلامی لەم وولاتەدا کتومت لـــەو قوناغـــە دەچێت کە بانگەوازی ئیسلامی لەشاری مەککەدا بەخۆیەوە دی‌و پیا ڕۆیشت ••

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەلایەن قورەیشەوە

چەندەها ئێش‌و ئازارو تاڵاوی پێ‌چێژراوە •• چەندەها
قسەی نەشیاوی بەرامبەر کراوە ، ناوو ناتۆری ناشیرینی
پێ‌گوتراوە ، پێیان دەگوت : شێت ، جادوو کەر ،
درۆزن !! •• تاد ••

ئەوەبوو « عوقبەی کوری ئەبی موعیط » عابایەکەی
لەملی پێغەمبەر ئاڵاندو ویستی بیخنکێنێ •• جارێکی‌تر
کە لەپەنای کەعبەدا نوێژی دەکرد ، عوقبەی لەعنەتی و
ئەمژە ناوسکی ووشترێکی سەربڕاوی هێناو لەوکاتەدا
کە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەسوجدەدا بوو
کردیان بەسەریا •• ئەو موسڵمانانەی کە لەو ناوەدا
بوون هیچیان نەیانوێرا لایبەن لەسەری !! چونکە
لەبەرامبەر دوژمنەوە لاوازبوون ••

ئەوەبوو خێزانەکەی ئەبولەهەب کۆڵە دڕکی
دەهێناو لەڕێگای پێغەمبەردا دایدەنا •• ئازاری
پێ‌بگات ••

زیادلەوە لەشەوی کۆچ کردنەکەیدا بۆ مەدینە
پیلانێکیان ڕێکخست بۆ کوشتنی ، ئەوەبوو چل گەنجی

ئازاو شەڕکەریان لەچـــەند هۆزوتیرە هەڵبژارد بـــۆ ئەنجامدانی ئەوپیلانە بەڵام ئەوەبوو خوا پاراستی ..

وەنەبێ ئەوڕۆژەی کە لەتایف گەڕایەوە لەجاران ئازاری کەمتر چێژتبێ .. ئەوە بوو ئەوبێ بەزەیـــانە مناڵە ووردەیان لێهانداو ئەوانیش بەردەبارانیان کرد تـا خوێن بەپاژنەی پێیدا هاتە خوارەوە ، لـەو کاتەدا لایدایە باخێکەوە ، خاوەن باخەکە بەزەیی پیاهاتەوەو منداڵەکانی لـێ دوورخستەوە .. ئینجـا سـەری بـەرزکردەوەو ڕووی‌کردە ئاسمان‌و بەم‌شێوەیە پاڕایەوە :

« خوایە لای تۆ سکاڵای بێدەسەڵاتی‌و بێهێـزی خۆم ، وە سوکیم لای خەڵك دەکەم ، تۆ خـــوای من‌و هـــەموو بێدەسەڵاتێکی ، بەزەییت لە هەموو کـــەس زۆرترە ، بـــەکێم دەسپێری ؟ بە بێگانەیـــەك کـــە بەڕووگرژی‌یەوە سەیرم بکـا ، یا بەدوژمنێك کاروبارم دەخەیتە ژێر چنگی‌یەوە ؟ ئەگەر تۆم لێ نەڕەنجێ‌ی ئەوێ نادەم بەهیـــچ ئازارێك » تا لەکـــۆتایی پاڕانەوەکەیدا فەرمووی « هیچ هێزو پەنایەك نی‌یە جگە لەتۆ » .

کاتێ مامۆستا ئەم پارانەوەی پێغەمبەری تەواو کرد، قوڵپەی گریان گەرووی گرت .. کەمێك بێدەنگ بوو، سەرنجی هاوەڵەکانیدا، لە نێوچاویانا ئەمەی بەدی دەکرد: پەیمان دەدەین بەم ڕێگەگرانو هەردوو هەڵەتەدا بڕوینو لە پێناوی گەیاندنی پەیامەکەی خوادا هەموو چەوسانەوەو ئازارو ئەشکەنجەیەك هەڵگرین ..

مامۆستا کە ئامادەیی تەواوی لە قوتابییەکانیدا بەدی کرد گوتی: برا خۆشەویستەکانم، دەبێ بزانین چۆن بۆ خوا کاربکەین، دەبێ عەقڵ فەرمانڕەوامان بێت .. نەك سۆزو عاتیفەی سەرکەش ..

ئینجا گوتی: کەوابوو، فەرموون بابڕوین لەسەر بەرەکەتی خوا، ئەوەتان لەیاد نەچێت ئێوە وەك کاروانێکی بازرگانی دەچنە ناوشارەوە کە لەنێوان وولاتی ئێرانو هیندستانا هاتووچۆدەکات، وە بازرگانەکان چۆن دەچنە [ کاروان سەراوە = النزل ] بەوجۆرە ئێوەش دەچنە ناوشارەوە .. کەڕۆژ بووەوە لەبارەی پێویستی سەرشانمانەوە بڕیار دەدەین ..

بەڵێ ، مامۆستاو هاوەڵەکانی لەشێوەی کاروانێکی بازرگانیدا ڕۆیشتنە ناو شارەوە ، لەکاروانسەرا لایاندا ، وولاخەکانیان بردە خانەودو خۆیشیان چوونە میوانخانەکەیەوە ..

نانی شەویان ئامادەکرد ، فەرموویان کرد لەوانەی دەورو بەریان ، ئەمەبووە هۆی ڕێ خۆش کردن کە بکەوێتە قسەو گفتوگۆ کردن لە گەڵیانا ، پاش نان خواردن دەست کرا بەقسە لەگەڵ میوانەکانی ترا ، قسەکانی مامۆستا سەرنجی ڕاکێشان باشتر لێی نزیك بوونەوە ..

مامۆستا باسی جوانیو خۆشی شاری کاشغەری کرد ، ئینجا میوانەکانی تر لەبارەی بارودۆخی شارەکەوە، وە لەبارەی خوو ڕەوشتی دانیشتوانیەوەو سروشتی فەرماندە سوپاییەکانو پلەوپایەی کاربەدەستانەوە ، دەستیان بەقسەکرد .. ئەوانەی کە مامۆستا هیوای خێری پیان هەبوو بێئەوەی کەس هەستی پێبکات لەدڵی خۆیا ناویانی تۆمار کرد ..

ئالەم قسانە بوونەوە شەو دەرنگ‌بوو ، هەمـوو ئارەزووی نوستنیان دەکـرد ئاپشـووبەدەن •• هەر کۆمەڵەو ئاقمەیەك ڕۆیشتە جێگای ئایبەتی خـۆی •• مامۆستا بۆئەوەی ناوەکانی لەیاد نەچێتەوە لـەدەفتەرێکی ئایبـەتا نووسینی •• شێوەی ئیش‌وکاری سـبەینێی ڕێکخست‌و ئامادەی‌کرد •• ئینجا هەموویان خـەویان لێ‌کەوت ••

## هەوڵی بێ ووچان

لەگەڵ بەرەبەیاندا مامۆستاو هاوەڵەکانی لەخــەو ڕاپەڕینو بێ‌قرەو ئاڵە دەستنوێژیان گرتو نوێژەکەیان کرد ..

لەوکاتەدا چۆلەکەکان شنەی شەماڵی پاکو فێنکی بەیانیان هەڵدەمژیو لەخۆشیدا جریوە جریویان بوو ، مامۆستاو هاوڵەکانی لەسەرخۆ بەرەو بازاڕ ڕۆیشتن .. شتیان دەفروشتو شتیشیان دەکڕی .. هەڵسو کەوتیان لەگەڵ ئەوخەڵکەدا بووەهۆی شارەزابوونی زیاتریان ..

ئینجا مامۆستاو هاوڵەکانی ڕۆیشتن بۆلای یەکێك لەو ئەمیرانەی کــە خێری لێ‌چاوەڕوان دەکرا ، پاش ئیزن وەرگرتن چوونە ژوورەوەو بەجوانترین شــێوە سلاویان‌کرد ، لەو دانیشتنەدا چەندەها قسەی خۆشو نەستەق‌کرا ، ئەمیر نرخێکی بۆقســەکانی مامۆســتا

دادەنا •• مامۆستا لەبارەی ڕەوشتی بەرزو خۆش ڕەفتاری‌یەوە قسەی بۆدەکرد ، ئەم قسانە بەتەواوی سەرنجی ئەمیریان ڕادەکێشاو کەمەندکێشیان کردبوو ••

ئینجا مامۆستا باسی خووڕەوشتی پێغەمبەری بۆکرد ، لەگەڵ ئەو بەرنامەیەی کەخوا بۆی ناردووە تا ئادەمیزادی پێ بەختەوەربێ ، لەو بارەیشەوە بەدرێژی بۆی باس‌کرد •• ئەمیر شەیدای قسەکانی بووبوو •• خواخوای بوو لەوبارەوە زیاتر بۆی بدوێ ••

لەئەنجامی دانیشتنەکەدا ئەمیر ڕووی‌پیشاندا ، بۆ وەرگرتنی ئاینی ئیسلام •• بەڵام بەمامۆستای گوت : لەوە دەترسم ئەگەر پاشا پێم‌بزانێت تاڵاو بکات بەگەرووماو بمکوژێت !!

مامۆستا گوتی : من دەمەوێ موسڵمان بوونەکەت تاکاتێکی گونجاو دەڕەخسێت ، ئاشکرا نەکەیت •• ئەمیر بەم قسەی مامۆستا زۆر دڵخۆش بوو ••

مامۆستاو هاوڵەکانی بەقەدرو ڕێزێکی فراوانەوە بەڕێ‌کرانو هاتنە دەرەوە ••

ئینجـــا ڕۆیشت بۆلای یەکێکی‌تر کە فەرماندەی
سوپابوو ، بەهەمان شێوەی پێشوو لەگەڵ ئەویشدا کەوتە
قسەو کۆو ئیسلامی پێ‌گەیاندو ئەویش ڕووی پیشاندا ،
مامۆستا داوای لەویش کرد موسڵمان بوونەکەی ئاشکرا
نەکات ..

لەماوەی چـەند ڕۆژێکدا ژمارەیەکی مام ناوەندی
لەئەمیرو فەرمانده‌کانی سوپا لەسـەر دەستیدا موسڵمان
بوون ، بەڵام لەچاو دەستەڵاتو ملهوڕی پاشـادا هێشتا
ژمارەیان کەم‌بوو ، لەبەرامبەر هێزی پاشـــا « تۆغـــا
تەیموورخان » وە هیچیان بۆ نەدەکرا ..

# لە زیندانا

ئێوارەیەکیان هەوا گەرم‌بوو ، مامۆستا جمال‌الدین‌و هاوڵەکانی ڕۆیشتبوونە دەرەوەی شاری کاشغەر تا پشوویەك بدەن‌و کەمێك هەوای پاك هەڵمژن .. وەلەو سوێنە دوور لەچاوودەمەدا باسی کاروباری بانگەوازەکەیان بکەن ، لەوماوەدا کەئەوان دانیشتبوون تەپ‌وتۆزێك لەدوور دەرکەوت ، نیشانەی کۆمەڵە سوارێك‌بوو کە بەرەوئەمان دەهاتن ..

مامۆستا بەپەلە فەرمانی‌دا بەهاوەڵەکانی سوار وولاخەکانیان بن‌و بەرەو شاری کاشغەر بگەڕێنەوە ، واپیشان‌بدەن هاتوون بۆ شت‌ومەك کڕین !!

زۆری پێ‌نەچوو تەپ‌وتۆز نەماو کۆمەڵێك ئەسپ‌سوار دەرکەوتن ، لەپێشەنگی هەموانەوە ئەسپێکی قەشەنگ‌و نایاب زینێکی زێڕینی لێکرابوو ، ملوانکەی

جڵەوەکەی بەدەست سوارێکی جوانخاسی ئازای
ڕووتبەرزەوە بوو ..

ژمارەیەك سوارەی‌تر دەوریان دابوو هەموو چاوەنواڕی فەرمانی بوون .. تا نزیکتر دەبوونەوە دڵی مامۆستاو هاوەڵەکانی ترپەی زیاتر دەبوو .. فەرماندەی سەورە ، بەتووڕەیی‌و قینەوە ئیشارەیەکی کرد بۆ سوارەکانی هاوەڵی ، تا بیان گرن..ئەوانیش وەك پزیسك ڕاپەرین ، بەوپەڕی زبری‌و توندی‌یەوە هێنانیان بولای .
مامۆستاو هاوەڵەکانی بەجارێك واقیان‌وڕما کەبۆیان دەرکەوت ئەم سوارچاکە ڕقاوی‌و لێ‌هاتووە پاشای پاشمەردو « تۆغا تەیمور خانە » !!
مامۆستا خۆی ئامادەکرد .. بەڵام هاوڵەکانی بەلێشاو پرسیار هێرشی دەهێنا بۆ مێشکیان‌و وەڵامیان نەبوو !!

پاشا فەرمانی‌دا «دەست‌و پێی هەموویان بەستن» کەلەبچەیان کردە دەستیان‌و بەستیانەوە ترسێکی زۆریان لێ‌نیشت کەپێیان زانراوەو نهێنی‌یان ئاشکرابووەو کەوتوونەتە

چنگی پاشاوە !!

وەنەبێ ئەوان لەمردن ترسابن •• چونکە مردن لەپێناوی خوادا ئاواتی ئـەوانبوو •• بەڵام ترسـەکەیان بۆ ئەوەبوو بانگەوازەکە بڵاو نەبێتەوەو کۆشکی هیوایان تێکدرێ ••

هەندێکیان لایان وابوو ، کە جاسوس هەواڵیداوەو شوێنەکەیانی پیشانداون •• پاشایش لەوەترساوە بەهۆی بانگەوازەکەی ئەمانەوە ، کورسی‌یەکەی لـەقبێ •• بۆیە ئەم کۆمەڵە سوارەی لەگەڵ خۆیا هێناوەو متمانـەی بەکەس نەکردووە •• تا بەدەستی خـۆی تۆڵـەیـان لێبسێنێ••هەندێکی تریان هەستیان بەوە دەکرد خۆیانو مامۆستایان بەهـەڵەدا چـوونو دەبوا باشتر خـۆیان بپاراستایـەو نهێنی زیاتریان بەکـار بێنایەت ، بـۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە •• چاریان نەما ، ئەوەنەبێ ملێن : « لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم ! ••



بەچەند سوارێکدا ئەم دیلانەی ناردەوە بۆ ناوشار

•• که خۆیشی لــــە گەشتەکەی بووەوەو گــەڕایەوە داوایان دەکات ••

بەڵام پێش ئـــەوەی بیانتێرێتەوە بۆشار پرسیاری لێکردن و گوتی : ئـەم ناوچـەیە پەرێزی ڕاوو شکاری خۆمە ، چۆن زاتی ئەوەتان بووە پێ بنێنـــە ناویەوە ؟ لەهەموو کەسێکم قەدەغـــە کردووە ، ئێوە چۆن تاوانی واتان کردوە ؟

هەرچەند ئەم پرسیارە هـــەڕەشەیەکی گەورەی تیابوو ، چونکە پاشا چاوی لێبز کردبوونەوەو ئاگـــری لێدەباری و دەینەڕاند بەســـەریانا ، بەڵام لای مامۆستاو هاوەڵەکانی وەك گۆزەیەك ئاوی ساردبوو بۆ هەناوێکی تینوو •• لەئاسمانی دەروونیانا هەموو پەڵە هەورێکی خەم و بەزارە ڕەوییەوە !! چونکـــە بۆیان دەرکەوت ، ڕق و تووڕەیی پاشا بەهۆی ئاگاداربوونی لــە بانگەوازەکەیان نەبووەو لە کاروکرداری ئەمان نەترساوە •• پاشا بۆیە ئاگری تێچووە دەست دریژی کراوە بۆ پەرێزی ڕاوو شکارەکەی •

بۆیـــه بەپەلە مامۆستا وەڵامی پرسیارەکـەی پاشای دایەوەو گوتی : پاشا ، ئێمـــه لـــەم وولاتەدا نامۆو نەشارەزاین ، نەمانزانیوە کە هاتوینە زەوی قەدەغەکراوی پاشاوە !!

پاشا گوتی : ئێوە خەڵکی کوێن ؟؟

مامۆستا گوتی : خەڵکی [ بوخارا ] ین ..

پاشا بە پەستی‌یەکەوە گوتی : وابزانم ئێوە لـــە وولاتی فارسن ؟؟

+ : بەڵێ ..

ــ : « سەگ بەنرخترە لەهەر فارسی‌یەك » !!

مامۆستا لەماوەی ئەم پرسیارو وەڵامەدا هەناسـەی هاسوودوە سەرخۆ ، بە هەڵی‌زانی ڕاستەقینە بۆ پاشـــا ڕوونبکاتەوەو بانگی بکات بۆ ئیسلامو ئەم هەڵە لەکیس نەدات .. هەرچەند لە حاڵێکی وادا بوو دۆستی پێ‌شاد نەدەبوو .. بۆیە لەوەڵامی ئەو قسە سووکەی پاشـــادا گوتی : « بەڵی ، لەوانەیە سەگ لەئێمـــه بەنرختربێت

ئەگەر ئێمە شوێن کەوتەی ئاینێکی ڕاست نەبووینایە ، !!

ئەم وەڵامە وەك هەورە بروسکەیەك وابوو بەلای « تۆغا تەیمور خانە » وە ، چونکە چاوەڕوانی ئـەوە ەبوو بەم نەترسی‌یە وەڵامی بدرێتەوە ، بۆیە فەرمانی‌دا بیان‌بەن کە لەڕاو کەڕایەوە بیان‌هێنن بۆلای خۆی ••



مامۆستا جمال‌الدین لەم هەڵوێستەیدا هەستی بـە سەرکەوتنێکی گەورەکرد •• وای دانا بەقـــەد هەموو هەوڵێکی لەمەو بەری بەسوود بووە بۆ خزمەتی ئیسلام •• چونکە بوارێکی بۆ هەلکەوت کەڕاستەو خۆ لەگەڵ پاشا بدوێ لەبارەی ئیسلامەوە ••

ئای مامۆستا چەند ئامەزرۆی ئەم ووتوویژەبوو •• چونکـــە زۆرباش دەیزانی ئاینی ئیســـلام هەمیشـــە سەرکەوتووە ئەگەر ئەوکەسەی باسی‌دەکات بزانێت چۆن باسی‌دەکات •• چونکە ئیسلام ئاینی عەقڵو مەنتیقە ••

مامۆستا هەستی بەخۆشی دەکرد چونکـــە ئاواتی

هاتۆتەدیو لەگەڵ ئەو پاشایەدا ڕاستەو خۆ قسەدەکات
کە بەهیچ کلۆجێك نەیان دەهێشت بیبینێت ٠٠ لەهەمان
کاتدا هاوەڵەکانی دەترسان لەدانیشتنی داهاتوودا شمشێر
دەوری خۆی بیبینێت !!



# مامۆستای بەندکراو لەبەردەم شادا

ئەو شەوە بەدەستی بەستراوەوە لە بەندیخانەدا هەزارەها خەیاڵیان دەکرد ٠٠ تیشکی زێڕینی خۆر تاریکی تەفرو توونا کرد ٠٠ تەقەی پێی پاسەوانەکان پەردەی بێدەنگی دڕاند ٠٠ هاوەڵەکانی مامۆستا هێشتا پەڵەی هەوری ترسیان نەڕەوی بووەوە ٠٠ لە داهاتووی نەزانراو دەترسان ٠٠ بەپێچەوانەی مامۆستاوە کە وورەی بەرزو هیوای زۆرو ویستێکی پتەوو هەڵوێستێکی نەگۆڕاوی هەبوو ، بگرە زۆر شادمان بوو بەهاتنی کاتی چاوپێکەوتن !!

پاسەوان دەرگای داخراوی کردەوە ٠٠ مامۆستایان دایە بەرو بردیان ، بەڵام مامۆستا لەوان بە پەلەتر بوو بۆ گەیشتن بەهیوای چاوەڕوانکراوی ٠٠ بەدەستی بەستراو بردیانە لای پاشا ، دیلێکی غەریب ، بێچەک و

سوپا ، نەکەس هەیە بەرگری لێبکات ، نەکەس هـەیە بۆی بپاڕێتەوەو تکای بۆبکات !!

بەڵام هەستی مامۆســـتا بەپێچەوانەی ئەوحاڵەتەوە بوو ، چونکە هەستی بەدەسەڵاتو هێزێك دەکرد ، کە هەڵێنجراو بوو لەدەسەڵاتو هێزی خوای بەتوانا •• وە ئەو هەستەی هەبوو کە ئاینەکەی بە جوانترین شـێوە بەرگری لێدەکاتو لـــە تیاچوون ڕزگاری دەکـات ، دڵنیابوو ئاینەکەی باشترین یارمەتی دەرو پشتیوانیەتی ••

پاشا هەر بیری لەم « ئاینەڕاستە » دەکردەوە کـە مامۆستای دڵقایم دەستی بۆکێشا •• دەبێ ئەم ئاینە ڕاستە چیبێ وا شوێنکەوتوانی دەکاتە پاڵەوانی ڕاستەقینە ؟ دەبێ دووجۆر ئاینهەبێ ڕاستو درۆ ؟

هێشتا پاشـــا دەوروبەری چۆڵ نەبووبوو ئـــەم پرسیارەی ئاڕاستەی مامۆستاکرد : مەبەستت چیيە کە دەڵێیت : ئاینیڕاست ؟ لـــە وەڵامدا مامۆســـتا « باسی بنچینەکانی ئیسلامی بۆکرد ، قسەکانی لەدڵی پاشادا زۆر

کاری گەر بوون ، نزیك بوو وەك مۆم بتوێتەوە ، بەڵام نەیویست دەری ببڕێت ..

ئــەوانەی لەدەوری پاشادابوون لەسەر داخوازی پاشـا ڕۆیشـتنە دەرەوە .. ژوورەکە بێدەنگی ڕووی تێکرد ، لەم ماوەی بێدەنگیەدا پاشا بیری دەکردەوەو لەدڵی خۆیا دەیگوت : ئەم ئاینەی مامۆستا باسی کـرد ئاینێکە عەقڵ پێی قایلەو مەنتیقیش پشت گیریەتی !!

لەو قەناعەتەدام باوەڕەکەی خۆم هیچو پووچـو بەتاڵە .. زۆر حەزم لـەم ئاینەیە کـە مامۆسـتا بـۆی باسکردم بێگومان دڵم ئاسودە دەکات ، ئاخر ، چـۆن ئادەمیزاد خــۆی بەعاقڵ بزانێت کەبتی داتاشراو لــە داروبەرد دەکاتە خوای خۆیو دەیپەرستێ ؟ یان چۆن ئادەمیزادێکی وەك خۆی دەکاتەخوا ؟.. یان چۆن واز لەپەرستنی ئــەو خوایە دێنێ کــە ئەم بوونەوەرەی بەجوانترین شێوە دروست کردوەو بە یاسایەکی ڕێك وپێك دەیبات بەڕێوە ؟

دیسانەوە بەخــۆی دەگـوت : باشــە وەزیرو

فەرماندەکان ، لەبارەی ئەم ئاینەوە هیچ‌نازانن ، ئەگــەر من موسڵمان ببم دەبێ هەڵوێستیان چۆن‌بێ ؟.. بێ‌گومان لەمن سەخڵەت دەبن !! لەوانەیشە پیلانێك دروست‌کەن‌و لە پاشایەتیم بخەن !!

ئینجــا ناوچاوی دابەیەکداو بــەم جۆرە وەڵامی خۆی‌دایەوە : مامۆستا لەبارەی ئــەم ئاینەوە حەقیقەت‌و ڕاستەقینەی پێشانــدام ئایا من پشــتی تێــکەم‌و چاو لــەو حەقیقەتە بنووقێنم کەوەك تیشکی خۆر دیارو ئاشکرایە ؟!
خۆ هەموو فەرماندەکانی سوپا منیان خۆش دەوێت‌و ئامادەی خۆبەخت کردنن لەپێناو مندا .. بۆچی باسی ئەم ئاینەیان بۆ نەکەم‌و داوای موسڵمان بوونیان لێ‌نەکەم ؟

پاشا لەوماوەی بێ‌دەنگی‌یەدا ئەم هەموو لێکدانانەوە هات بەخەیاڵیا .. نا نا خەیاڵێکی تری‌کردو نزیك‌بوو لــە بیرکردنەوەی پێشوو لای‌بدات .. ئەوەی کە هــات بەخەیاڵیا ئەمەبوو :

کاتێ خــۆی « جەغتای » باپیرەیان شاهەنشاهی

« امپراطورية » یەکی گەورەی دامەزراندبوو •• بەڵام لەگەڵ ڕەوڕەوەی ڕۆژگاردا ئەم وولاتە پان‌وپۆڕە پارچە پارچەو بەش بەش بووبوو ، گەورەترینیان شانشین « مملكة »ی کاشغەر بوو کەلەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بوو، تۆغا تەیمور خان دەیویست ئەم پارچانە بکاتەوە بەیەكو وولاتێکی یەکگرتووی لێ پێك بێنێت ، بە سەرکردایەتی خۆی •• لەبەرئەوە دەترسا ئەگەر موسڵمان بێت ئەو هیواو ئاواتەی نەیەتەدی !!

بەڵام قسەکانی مامۆستاو ئاینی ئیسلام ئەوەندە چووبوە دڵیەوە وای لێ‌هاتبوو لەپێناوی ڕاستەقینەدا ئەو هیواو ئاواتەی بخاتە ژێرپێ •• هاتە سەرئەوە موسڵمان بوونی خۆی ئاشکراکات‌و بڕیاری موسڵمان بوونی خۆی بدات •• بەڵام بیرێك هات‌بەخەیاڵیاو زۆر پێی شادمان بوو ••

لە ماوەی ئەم بێ‌دەنگی‌یەدا ، مامۆستا بەدڵ لەخوا دەپاڕایەوە دەستی بگرێت‌و دڵی بەتیشکی ئیسلام ڕووناك بکاتەوە ••

امۆستاو پاشا بۆ یەکتریان دەڕوانی چاویان بڕیبوە یەکتر ، مامۆستا چاوەڕوان بوو پاشا قسەیەکی وا بکا کە دڵخۆشی کات ..

تۆغا تەیمور خان ڕووی کردە مامۆستاو گوتی :
مامۆستای پایەبەرز ، من لەم ماوەیەدا سەرنجی قسەکانی تۆمدا کە لەبارەی ئاینی ئیسلامەوە بۆت باسکردم ، بیرم لێدەکردنەوەو لەوبارەوە سێودووی دڵی خۆمم دەکرد .. گەیشتمە ئەو ئەنجامە کە قسەکانت ووردو ڕێك‌وپێك‌و تەواون لەبەرئەوە پێم خۆشە ببمە موسڵمان وە ئامادەم لەپێناو ووشەیەکی حەقدا موڵك‌و ژیان‌و دەسەڵاتی خۆم لەدەست‌بدەم ..

بەڵام من وام پێ‌باشترەو بەرژەوەندی ئەم ئاینەش واچاکترە موسڵمان‌بوونی خۆم ئاشکرا نەکەم ، تا وڵاتی‌جەغتای دەکەمەوە بەیەك ووڵات .. ئەگەر پاش ئەم سەرکەوتنە ، موسڵمان بوونی خۆم ئاشکرابکەم شوێنەوارێکی گەورەو سوودێکی زۆرتری دەبێت ..

مامۆستا کە ئەم قسەی لەدەمی پاشا بیست نزیك بوو
ـایمەرگ بپێت •• دڵودەروونی گەشایەوە •• ئەم ڕا
ـی پاشای زۆر پێ جوان بوو ، چونکە دووربینی تیابوو !!
ۆر سوپاسی کردو پشت گیری کرد ••
پاشا گوتی : هەرکاتێك بیستت وولاتی بەش کراوی
وباپیرانم کردۆتەوە بەیەك وولاتی یەکگرتوو ســەرم
ێ بدەرەوە ••



مامۆستا نیازی وابوو هەستێ و بڕوا ، پاشا گوتی :
ـامۆستا ، لەسەرخۆبە ، وابزانم هاوەڵەکانت لەبیرچووە
کە هێشتا لەبەندیخانەدان ؟
مامۆستا گوتی : بەڕاستی هەڵـوێستەکـە نــەك
هــەرئەوانی لــەبیربردمەوە بەڵکــو خۆیشـــمی
لەبیربردمەوە ••
پاشــا چەپڵەیەکی لێدا •• خزمەتکارەکان گورج
ـەتە ژوورەوە فەرمانی دا خێرا بەندییەکان بەرەڵاکەن و
بەڕێزەوە بیانهێنن بۆلام !!

## هاوەڵەکان بەفێڵیان زانی

پاسەوانەکانی بەندیخانە کلیلیان هێنــا تـا دەرگـا لەبەندی یە غەریبەکان بکەنەوە .. ئەوانیش کــەدیان واماموستا لەگـەڵ پاســەوانەکاندا نەهاتــەوە ، بەتەواوی ترسان .. لەبەر خۆیانەوە گوتیان : ئەوەی چاوەڕوانمان دەکرد هاتەدی .. گومانەکانمان بەڕاست دەرچوو .. ئەوا پاسەوانەکان دەمانبەن بۆ شوێنێك ئیتر گەڕانەوەمان نابێت .. بێگومان بۆلای ماموستایشمان دەبەن !!

پاسەوانەکان زۆر بەئەدەبەوە قســەیان لەگــەڵ دەکردن‌و ڕێزیان لێدەگرتن ، بەڵام ئەمان دڵیان هــەر لەمشتیانابوو !! چونکە وایان دەزانی ئەمە فێڵ‌و تەڵەکەیەو پاشا دەیەوێت باشتر ئازارو ئێشیان پێبگەیەنێت !!

بەڵام ئیمان‌و باوەری پتەویان کەم کەم خەریك‌بوو بەسەرترسی ناکاوو کوتوپڕیاندا زاڵ دەبوو .. ئەوەیان

یادکەوتەوە کەهـــەموو شـــتێك بــەدەست خوایە ٠٠ لەبیرەوەری خۆیاندا ئەو پــەیمانەیان یادکەوتــەوە کــە بەستبوویان لەگەڵ مامۆستادا ٠٠ ئەم دەستەواژە کاری گەرەیان دووبارە دەکردەوە : « خوایە مەبەستم تۆیـــەو ڕەزامەندی تۆم دەوێ ٠٠ »

وە هەروەها یادیان کەوتەوە کە ئەمان گیانی خۆیان بەخوا فرۆشتووە ، لەبەرئەوە خـــۆیان بۆ هەڵوێستی سامناك ئامادەکرد ٠٠ ئەوەیان هێنایە پێش‌چاویان کەمردن دیاری‌یە بۆ خاوەن‌باوەڕو ڕێگای بەهەشتیان بۆ دەکاتەوە ٠٠ ئەم ژیانە چ نرخێکی‌هەیە ئەگەر ڕێگای مامۆستایان نەگرنە بــەر ؟!



هەموویان گەیشتنە دەرگای دەرباری شا ، بردنیایە ژوورەوە ، بەووره‌یه‌کی بەرزو باوەڕێکی پتەوو دڵێکی قەوی‌یەوە ٠٠

ئای لەناکاودا چییان دی ؟!!

سەرنجیان‌دا ماموستایان هێشتا ماوە •• نەك هەرماوە بەڵکو لەتەنیشتی پاشاوە دانیشتووە ، بەوپەری ڕێزەوە !!

هاوەڵەکانی ماموستا ماوەیەك لەجێی خۆیاند ووشك بوون ، حەپەسان •• بێ ئاگابوون لە وەڵامدانەوەی پاشا ، کە ڕێزی لێ گرتن و داوای لێ کردن لەنزیك خۆیەوە دابنیشن !!

زۆری پێ نەچوو گەردو غوباری ڕووداوی کوتوپڕیان لەخۆیان تەکاندو سلاویان کرد لە [ پاشا ] ، لە نزیکیەوە دانیشتن‌هەناسەی ئاسودەیان‌دا •• بەو هەموو ڕێز لێ گرتەی پاشا زۆر دڵخۆش و شادمان بوون ••

## مامۆستاو هاوەڵەکانی دەگەڕێنەوە

لەگەڵ خەندەلێوی خونچەی بەشــەونم تەڕبووو شنەی شەماڵی بەرەبەیان ، مامۆستاو هاوەڵەکانی شــاری کاشغەریان بەجێهێشت .. پاش ئـەوەی تۆوی ئیسلامیان لەدڵی پاشاو فەرماندەکانیا چـاند .. مامۆستا بــەدڵ لەخوا پاڕایەوە چاودێری ئەوتۆوە پاکەبکات .. تاکاتــی دێت بۆ چەکەرەکردنو سەوزبوونو گوڵکردنیو خەڵکیش بۆی خۆشوپاکی مەڵدەمژنو شەیدای جوانیە دڵڕفێنەکەی دەبنو بولبولی خۆشئاوازی بانگــەوازی ئیسلامی لە چوارچێوەی وولاتا دەچریکێنێ ..

کاروان کەوتەڕێ شیوو دەشتو دۆڵی دەبڕی .. زۆری پێنەچوو هاوەڵەکانی مامۆستا لەدەریای بێبەیی سەرسامیدا نوقوم بووبوون .. ئـــەم مەتـەڵەیان بـــۆ هەڵنەدەهات ..

مامۆستاش لەبیرکردنەوەدا ڕۆچووبوو .. بیری

لەو ڕێکەوتنەی نێوان خۆیو پاشادە کردووە ، لەئەنجامدا کــــەوتە نزاوپاڕانەوە لـــەبارەگای پەروەردگارا کـــە پاشاجێگیرکات لەسەر ڕاستەشەقامی ئیسلامو بتوانێ ئەو بەڵێنەی بێنێتەدی ..



هاوەڵەکانی مامۆستا هەرچەند گۆڕانی ناکاوی پاشا بیروخەیاڵی داگیرکردن ، بەڵام هەموو بیرکردنەوەیان لای موسڵمانبوونی پاشابوو !!

ئـــەمان بەتەمای ئەوەبوون پاشا لەناو عەشاماتێکی زۆرا موســـــڵمان بوونیخۆی ئاشکراکات بەڵامشـــتیوا ڕووینەدا !! بۆچی ؟

ئەمپرسیارە لەمێشکیانا بوو بووە مەتەڵێكو بۆیـــان هەڵنەدەهات ..

چونکەمامۆستا پێیینەگوتبون : هۆیچییە پاشـــا موسڵمان بوونیخۆی ئاشکرا ناکات !!

ماموستا نهێنی ئەوڕێکەوتنەی نیـــوان خۆیوپاشای

سپاردبووە قاسەی دەرروونی .. بەلای هیچ کام لەهاوەڵەکانیەوە باسی نەکرد .. دەترسا لەوەی عاتیفەوەزۆز هەڵیان بێ بۆ باس کردنی و ببێتە زیانێکی ئەوروە بۆ داهاتووی ئیسلام .. ئەوە نییە دەڵێن : قسەکە وتە زاری دەکەوێتە شاری .. لەبەر ئەوە کە نەیان دەزانی لەنێوان پاشاو مامۆستا چی ڕوویداوە ؟ سەراسیمە بووبوون .. چونکە مامۆستا زۆر لەپاشا ڕازی بوو دوعای خێریشی بۆدەکرد !!

کۆمەڵی سوارە ـ مامۆستاو قوتابیە هاوەڵەکانی ـ بەرەو ڕۆژئاوا .ەڕۆیشتن ڕووەو شاری بوخارا ـ شارەکەی خۆیان ـ هەتا نزیکتر دەبوونەوە ئارەزوومەندی ماڵومنداڵیان زیاتر دەبوو !!

پێیان سەیر بوو ، ئەم ئارەزوومەندی یە بۆ ئێستا سەری هەڵداوە ؟! خۆ لەماوە دووروودرێژەدا ئەم هەستەیان کپ بوو ..

بەڵێ گەیشتنە دەوروبەری دەرگاکانی شار و گڕی

ئارەزووی دیداریان بڵێســەدار تربوو !٠ چاوەڕوانی
ئەوەبوون مامۆستا ئیزنیان بداتو بڕۆنەوەماڵخۆیان !!
مامۆستا کــەزانی ئامەزرۆی دیداری منــداڵن
ئیزنیدانو ئــەوانیش گورج خــوا حافیزییانکردو
هــەریەکەیان بــەدیداری خێــزانو منــداڵیخۆی
شــادبووەوە ٠٠ پاش دوورکەوتنەوەیەك کەبەتــەمــای
گەڕانەوە نەبوون ٠٠

# بەڵە هەورێکی خەمو پەژارە

ماموســـتا لەدەریای بیر کردنـەوەدا ڕۆچووبوو ، دڵودەرووونی بەخـەموپـەژارە پڕبووبوو ، هـــەرمۆی ئەوەش بوو بەتاڵووکەنەبوو ، زۆر لەسەرخۆ بەرەوماڵەوە دەڕۆیشت ..

هـــەموو بیر کردنەوەکـــەی لەمبارەوەبوو : ئایا بڕوابکات « تۆغا تەیمورخان » پەیمانەکەی ڕاستبێتو بەڵێنەکەی بێنێتەجێ ؟ خۆ ئەگــەر ئێســتا ڕاستبێ ، کێ دەڵێ هەروادەمێنێتەوە لەداهاتوودا ؟ ئینجا کێ دەڵێ ئەو ئاواتوهیوایەی پاشادێتەدیو وولاتی باپیرانی دەکاتەوە بەیەك پارچە ؟

بۆ ئـــەمهەموو وتوویرەو ترســە دەروونی یەی ، چارەیەکی نەدی یەوە تەنیـــا پەنابردنەبەر نزاوپاڕانەوە نەبێت ــ بۆیە بەمجۆرە لەخوا دەلالایەوە :

ئەی‌خوایە ، تۆئاگاداری نهێنی‌و ئاشکرای‌منی ••
تۆ لەخۆم ئاگادارتری بەسەر دەروونمدا ••
خوایە ، خۆت‌دەزانیِ ـ زەحمەتی زۆرم‌کێشا ـ
ئەگەر لەبەرخاتری تۆبووبێ ••

وە لەپێناوی بەرزبوونەوەی ووشەی « لا اله الا الله »
بووبێ ••

ئاینی خۆت سەربخە •• جمال‌الدین سەرمەخە ••
« یا عزیزو یاقهار » ئەی بەدی‌هێنەری ئاسمانان ••
ئەی پەروەردگاری‌من ••
شیاوی ئەوەنیم ببمە هەڵگری بانگەوازەکەی‌تۆ ••
من پێویستم بەتۆهەیە •• تۆپێویستت بەمن‌نی‌یە ••
هیوام بەڕەحمەتی تۆیە ••
ئـــەی هـەڵەوگێڕ « مقلب »ی دڵان •• دڵمـــان
سەقامگیرکە ••
ئەی پەوەردگار ••

ئەی ئەوکەسەی بە ئیشارەتێکی تۆ دڵان‌دەبزوێ ••

دلی « تۆغـــا تەیمورخان » لەســــەر ئاینەکەی خـۆت سەقام گیرکەیت ••

یارمەتی بدەیت بۆ سەرخستنی شەریعەتەکەت •• ئەی خوایە •• ئەمە تکامانەو •• ئەمە داوامانە •• قســـەی تۆڕاستەو خۆیشت فەرمووتە : « أدعوني أستجب لكم •• »

داوا لەمن بکــــەن لێتان وەردەگـــرم و وەڵامتـــان دەدەمەوە •• ئـــەوا ئێمـــە داوامان لێ کردی •• تۆش داواکەمان گیراکە ••

هەموو ڕێگەیەکی مادیمان گرتـــەبەر •• هـــەموو توانای خۆمان خستەکار •• چاردیـــەکمان نەماوەجگــە لەپەنابردن بەتۆ ••

« یا سمیع و یا مجیب » داخوازی و تکامان وایە : دلی « تۆغـــا تەیمـــورخان » جێگیرکـــەیت لەســـەر ئاینەکەی خۆت •• وە ڕێنمونی بکەیت بۆڕێگە ڕاستەکەی خۆت ••

« يا مجيب الدعوات •• يا رب العباد » چاكـــەو ڕاستیو تێگەیشتن بخەیتە دڵیەوە ••

مامۆستا تا لەمڕازو نیازو پاڕانەوەیە تەواوبوو خۆی لەمزگەوتەکەیا بینیەوە ، ڕووی گەشبووەوە ، کەدیتی وامزگەوتەکەی بەنوێژگەرو قوتابیانو عابیدان ئاوەدانە • لەمیحرابی مزگەوتەکەدا دووڕکات نوێژی کـردو لای کردەوە بەلای ئەوناسراوو هاوەڵانەیەوە کەوەختبوو بانکرنەوە لەخۆشی هاتنەوەی مامۆستایان بەبێوەی ••

مامۆستا سلاوی لێکردنو ئەملاولای ماچکردن ، هەموو دەوریاندا ، چاوەڕوانی ئەوەبوون ، مامۆســـتا بەسەرهاتی ئەمسەفەرە پیرۆزەیان بۆبگێڕێتـــەوە ، تـا بەدەسکەوتەکانی شادمانبن ••

مامۆســـتا بیری کردەوە چی بەوخەڵکە بڵێ کـــە تامەزرۆی بڵاوبوونەوەی ئیسلامن لەووڵاتی مەغۆڵدا ؟! ئایا ڕاستەقینەیان پێبڵێو پەردە لەسەر ئەونهێنییە لابات کەلەنێوان خۆیو توغا تەیمورخاندا بووە ؟ ئەگەر

وادەکات پەرهەمی ئەوتێکۆشانو هەوڵدانەی بەزایە
دەدات !! وە زیان دەگەیەنێ بە داهاتووی ئیسلام لەو
وولاتەدا ..

ئەگەر دەڵێت هیچم نەکردووە .. دەڵێن ئەم
سەفەرەت بۆچی کرد ؟ ئەگەرباسی ئەوەیان بۆدەکات
ڕێگەی ئەووولاتە دوورو درێژەو زەحمەتو
ڕەنجی زۆری کێشاوە .. ئەگەرباسی ئەوەدەکات کە
پاشاو فەرماندەکانی ڕێزی زۆریان لێ گرتووە !! پێی
دەڵێن : جا تۆ بۆئەوە ڕۆیشتیت ؟ لەوانەیە تووشی
ڕەنجەڕۆیی بن .. ئەی کەوابوو باسی چییان بۆبکات ؟
چییان پێ بڵێت ؟!

مامۆستا بڕیاریدا نهێنییەکە نەدرکێنێ .. بۆیە
وای بەچاکزانی پێیان بڵێ : سوپاس بۆخوا
لەسەفەرەکەماندا سەرکەوتوو بووینو هیوایەکی
گەورەمان پێیەتی !!

خەڵکەکە نەیانویست هەتەری « الحاج » بکەنو
سەربنێنەسەری ، بۆیە گوتیان : واچاکە مامۆستا

ماندوونەکەین با سەرێك لەماڵ بداتو ئیسراحـەت بکات چونکە شەکەتی ڕێگایە •• دوعای خێریان بۆکردو خوا حافیزی یان لێ کردو مامۆستاش ڕۆیشتەوە بۆماڵ ••



مامۆستا هەربیری لەپاشاو فەرماندەکانیو شـاری کاشغەر دەکردەوە •• خەمو پەژارە لەڕواڵەتیا بەدی دەکرا •• وە ئـەوزەردە خەندەیەی کە بەزۆر دەیهێنـایە سەرلێوەکانیەوە هیـچ سوودێکی نەبوو کـە بەرەوڕووی خێزانو منداڵەکانی بووەوە ••

« رشیدالدین »ی کوڕی هـەستی کرد کـەباوکی بەهۆی شتێکەوە سەخڵەتەو نەیدەزانی ئەو شتەچی یە ؟! هـەموو ئەرەسەیەکی پشوودانی بـۆ ئامادەکرد تـا بحەسێتەوە •• باوك ، ڕۆیشتە سەرجێگە بـەو هیوایەی پشووبداتو بحەوێتەوە ، چونکـە لەمێژبوو بـەپێی پێویست ئیسراحەتی نەکردبوو •• سەفەر لەخـۆیدا سزایـە ، با ترسی ڕێگەو شەونخونیو دوورو درێژی

ڕێگە بوەستێ ، سەرباری هەمووی دوژمنایەتی مەغـۆل بۆ ئیســـلامو موسڵمانان .. بـــەڵام خەو لەچاوەکانی تۆرابوو ، لەناو جێگەدا هەر تەپاوتلی بوو ..

خەو چۆن دەچێتەچاویەوە ئـــەو کـە بیروهۆشی بەبەڵێنی « تۆغا تەیمورخان »ەوە خەڕۆبوو ؟!

لـــەدڵی‌خۆیدا دەیگوت : نازانم بەلای هـــاوەڵە نزیکەکانمەوە ، ئەم نهێنی‌یە بدرکێنم یانـــە ؟.. لێکی دەدایەوەو دەیگوت : بەرژەوەندی ئیســـــلام لەوەدایە نەیدرکێنم .. ئەی ئەگەر هات‌ومردم ؟

خـــۆ هـەموو کـــەسێك دەبێ شەربەتی مەرگ بنۆشێ ، وەمنیش دەمـــــرم ، دەترسـم ئـەم‌نهێنی‌یـە لەگـــەڵ‌خۆما ببەمە ژێرخاك .. بەدی‌هێنانی بەڵێنەکەی پاشایش پەیوەندی بەیادخستنەوە هـەیە .. ئەگەرمنیش ئـەم‌نهێنی‌یە بەکس‌نەڵێم ، ئـەوا کـەسیش نابێت یـادی بخاتەوە !!

لەبەرئەوە ناچارم دەبێ ئەم‌نهێنی‌یە بدرکێنم لەلای

کەسێك کە جێگەی بڕوابێتو دڵسوزو لێزانیش‌بێت ..
چونکە دەبێ بزانێت چـــۆن باسەکەی لەگەڵ بکاتەوەو
چۆن ڕێ بۆ مەبەستەکەی خۆش‌کات ؟!

لەگەڵ‌ئەوەدا مامۆســـتا ماوەیـــەکی‌دوورو درێژ لەم زۆرابـــازی‌و ملانەیەدا مایـــەوەو بەلای‌کەســەوە باسی‌نەکرد ..

لەئەنجامدا بەتەواوی بڕیاری‌دا دەست‌بەکاربێ بۆ دۆزینـــەوەی کەسێکی‌وا کـــە متمـــانەی‌پێ‌بکـــات توانای‌گەیاندنی ئەوسپاردەیەی هەبێت ...

# هیوای چاوەڕوان کراو

مامۆستا هاتبووەسالەوە ، لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕۆژگارا ئەویش بەرەو کزی و لاوازی و پیری دەچوو •• زۆربەباشی بیری کردەوە ، ئەهەموو ڕوویەکـــەوە مەبەســـتەکەی هەڵسەنگاند •• بڕیاری دا بەخەستوخۆڵی و بەچڕوپڕی خەریکی پێگەیاندن و پەروەردەکردنی [ رشیدالدین ]ی کوڕی بێت ••

رشـــیدالدین لای باوکی و زانایانی پایەبـــەرزی [ بوخـــار ]دا خوێندنی ئەوسەردەمەی تەواوکـــردبوو « ئیجازەی عیلمی » وەرگرتبوو ، لەهەمان کاتدا ڕێگـەی پەروەردەکردنی « ڕۆحی » لای چەندان پیری بەهرەمەند گرتبووەبەر ، ئینجـــا لەوبارەوە باوکیشی سەرپەرشتی دەکرد •• کوڕیش ئارەزوومەندی ڕووکردنە خوابوو •• تاوای لێهات دڵی بەنووری خوا ڕووناك بووەوەو

ستی‌وای دەبینی بـــەچاوی دڵ ، کـــە بەچاوی ئاسایی نەدەبینرا ..

پیری زۆری بۆمامۆستا هێنابوو ، لەژێر باری گرانی ئەو ساڵە دوورودرێژانەی چاوەڕوانیدا ماندوبووبوو ..

وەنەبێ لاوازیو کزی هێزی لەشی وای لێ کردبێ بەڵکو ئارەزووی بەردەوامی بۆ ڕۆژهەڵات کزو لاوازی کردبوو..چونکە هەمیشە چاوی بڕیبوە هەواڵو دەدگ‌وـ باسی «کاشغەر» بەڵکو لەبارەی هیواو ئاواتەکەیەوە شتێکی دەسگیربێ ، تاخۆی ماوە خـــەوو ئاواتەکەی بێتەدیو « تۆغاتەیمورخان » موسڵمان‌بوونی خۆی ئاشکراکات !!

بـــەڵام ئەوهەواڵانەی لـــەبارەی پاشای کاشغەرەوە پێی‌دەگەیشت ئەوەنەبوون کە دڵی‌مامۆستا ئاسوودەبکات ، تەنیـــا تێك‌هەڵچوونو شەڕوشۆڕێکی دیاری‌کراونەبێت هیچی‌تر نەبوون ..

چەندەهـــا شەو لەگەرمەی‌خـــەودا ڕادەپـــەڕیو شەونوێژی دەکردو لەخوا دەپاڕایەوە « تۆغـاتەیمور »

سەرخات ، تابەسەرکەوتنی ئەو ، ئیسلام لەو وولاتەدا سەرکەویت و بلاوبیتەوە ..

بەلام ئاواتی نەهاتەدی .. ماندوبووبوو بەدەست باری گرانی چاوەڕوانیی و خۆگرتنی دریژماوەیەوە !!

سێ سالی ڕەبەق چاوەڕوان بوو ، چاوی بڕیبوە ڕۆژهەلات ، گوێی گرتبوو بۆ هەوال و دەنگ و باسی پاشای کاشغەر ، بەلام بێهوودەبوو !!



# نەخۆشی کۆچی دوایی

مامۆستا نەخۆش کەوت ، ئەم نەخۆشی یەش دوا نەخۆشی بوو ، دۆستان و هاوەڵان و خزمانی بەدەوریا گردبوونەوە .. هەستی دەکرد مردنی نزیك بووەتەوە.. زۆر دڵگران بوو کە لەژیانی خۆیا ئاواتەکەی نەهاتەدی.. بەڵام دڵخۆشی خۆی دەدایەوەو دەیگوت : هەموو شتێك لای خوا دیاری کراوە ، من جوتیارێك بووم تۆو چاندنم لەسەربوو ، سەوزکردنی بە دەست خوایە ..

رشیدالدین ی کوڕی کە جێگەی هیوای بوو بانگی کردە لای خۆیەوەو پێی گوت : دەمەوی وەسێتێکت « وصية » بۆبکەم ، کاتێ کەدەورم چۆڵ بوو ..

خزمان و دۆستان هەستان و دوعای خێریان بۆمامۆستا « جمال الدین » دەکرد .. تەنیا «رشیدالدین »ی کوڕی لای مایەوە ، هەرچی نهێنی هەبوو لەدڵیا

بۆی‌درکاند ، لەبارەی چاو پێ‌کەوتنی نێوان خـــۆی‌و « تۆغا تەیمورخان »ەوە •• بەڵێن‌و پەیمانەکانی پاشای هەموو بۆ باسکرد ••

داوای لێ‌کـــرد ڕۆژ بەڕۆژ هەواڵی « تۆغـــا » بزانێت ، هەرکات زانی پاشا سەرکەوتووەو وولاتی پارچە پارچەکراوی « جەغتای » کردۆتەوە بەیەك وولات •• بچێت بۆلای‌و بەڵێن‌و پەیمانەکەی یادبخاتەوەو داوای جێ‌بەجێ‌کردنی لێ‌بکات ••

بەچەند ووشەیەك وەسێتەکەی تەواوکردو گوتی : « کوڕی‌خۆم ، گوێ‌بگرە بزانـــە چیت‌پێ‌دەڵێم جـــوان لەبەری‌بکەو لـــەیادت نەچێتەوە ، سوور بەلەســـەری « حریص »و بڕۆی بۆلای ، لەمنەوە سلاوی پێ‌بگەیەنە نەترسی لەیادخستنەوەی ئەو بەڵێنەی‌داویەتی بـــەمن ، « تۆغـــا تەیمورخـــان » ڕۆژێك‌لـــەڕۆژان دەبێتـــە پاشایەکی گەورە » •

ئینجا چاوی بڕی‌یە ئاسمان‌و گوتی : خوایە ، تۆ بەشایەت‌بە ئەوامن سپاردەکەم‌دایەوەو پەیامەکەم گەیاند

•• ئـەوەی لەتواناما بووبێ لەڕێی ئاینەکەی تۆدا درێغیم نەکردووە ••

پاش ئەمقسانە مامۆستا گەرووی گیراو دەنگی کپ‌بوو ، تواناى دەربڕینی دەنگی نەما •• لێوەکانی دەجوولاندەوەو دواقسەی شایەتمان‌بوو پەنجەی بەرزکردەوەو دەیگوت : أشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله ••

مامۆستا لەجموجووڵ کەوت •• ئەو دڵەی کە بەیادی‌خوا ئاوەدان‌بوو لە لێدان‌کەوت •• ئەو پیاوەی کە هەمووژیانی بۆخوا تەرخان‌کردبوو ـ لە خوێندن‌و دەرز وتنەوەو پەروەردە کردنی گیانی‌و بلاوکردنەوەی پەیامەکەی ئیسلام‌و ڕێنمونی‌کردنی خەڵکی ـ بۆهەمیشە چاوەکانی نابەیەکداو خوای لەخۆی ڕازی کرد ••

گیانی دای لەشەقەی‌باڵ‌و بەرەو بەهەشتی بەرین پەروازی‌کرد ، جیهانی هەوڵ‌و کوششی جێ‌هێشت‌و بەرەو نازو نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشت کەوتەڕێ ، ئەم ئایەتەی قورئان لەگوێی قوتابییەکانیا دەزرنگایەوە

« يا أيتهـــا النفس المطمئنـــة ارجعي الى ربك راضـية مرضـــية •• » ئـــەی گیانی دڵنیا بگـــەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت لەخوای خۆت ڕازی بوویت و ڕەزامەندی خوات بەدەست هێناوە ••



« رشـــيدالدين » ســـەری نا بـــەسنگی باوکیەوە هەستی کرد گیانی تیانەماوەو دڵە پاکەکەی لەلێدان کەوتووە •• وەك هەڵاڵەبرمە فرمێسك بەچاوەکانیا هانەخوار •• فرمێسکی کـوڕ بۆباوك ، فرمێسکی قوتابی بۆماموستای خۆی •• فرمێسکی مورید بۆ پیروەدەزگیری خۆی •• ئـەو مامۆستاو دەزگیرەی کە بەشیری باوەڕ پەروەردەی کربوو •• ئـــەو فرمێسکانە چـــەند گـــەورەبوون !! فرمێســکەکان ، فرمێســکی ئاســایی نـــەبوون فرمێسـکی دڵ و دەروون بوون ••

بەڵام گریان چ سوودێکی هەیە ؟• باوکی •امۆستای بۆ شتی وای ئامادە نەکردووە •• بۆ بەجێ هێنانی چەند ئەرکێکی گەورەو گرنگ پێی گەیاندووە •• پێویستە

لەسەری ئـــەو ئەرکانە بـەجێبێنێتو شوێنپێی باوکی نەوێت !!

ماموستا « رشیدالدین » ڕاپەڕیو بڕیاریدا یادی باوکی بەزیندویی بێڵێتەوەو ئەو هیواو ئاواتانەی باوکی بێنێتەدی ، بەتایبەت ئەو نهێنییەی کە باوکی پێیسپاردو بڕوای پێیهەبوو ئەنجامی دەدات ..

ڕەوڕەوەی ڕۆژگار لە سووڕانەوەی بەردەوامدایە .. ماموستا رشیدالدین چاوی بڕیوەتە ڕۆژهەڵاتو دڵی لەلای شاری کاشغەرو پاشاکەیەتی .. ئەو شارەو ئـەو پاشایەی کەتەنیا ناویانی بیستووە ، بۆیە هەمیشە پرسیاری دەکرد .. هەرکەس لەوێوە بهاتایە پرسیاری لێدەکرد تالەوبارەوە دڵئاسوودە بێت .. هـەمیشـە دەســـتی بەرزدەکردەوەو دەپاڕایـەوە هیـــواو ئاواتەکەی باوکی بێتەدی ..



# کاتی چاوەڕوان کراو

ئای ئەوکاتە چ کاتێك‌بوو !! کەمامۆستا رشیدالدین هەواڵی بیست « تۆغـــا تەیمورخان » هێرشی کوتوپڕی بردۆتە سەر ئەودەوڵەتۆکە « دویلە » پچووکانەی کـە لەشاهەنشاهیەتی « جەغتای » جیابووبوونەوە •• وە بەسەر هـــەموویاندا زاڵ‌بووەو دەوڵـــەتێکی یەکگــــرتووی پێك‌هێناوە ••

مامۆستای لاوو تازەپێگـــەیشتوو ، سەرکـــەوتنی « تۆغا » بەتەواوی دڵخۆش‌و شـــادمانی‌کرد ، لەخۆشـیدا سوجدەی شوکری بۆخوا برد •

« رشیدالدین » دڵنیـــابوو ئـەوا کاتی هـ ـەوڵو تێکۆشـــانی هاتووەو دەبێ دەست‌بەکـــاربێ •• بۆیـــە شتومەکی سەفەری پێچایەوەو خـــۆی‌ئامادە کـــرد ، ئاوزەنـگی لـەووڵاخەکەی داو مـاڵ‌ئاوایـی کـــردو شاری [ بوخارا ]ی جێ‌هێشت ••

ڕووەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت ، ئـەو دەشت‌و دۆڵو

شاخ‌و لاپاڵانەی دەبڕی کەباوکی لەمەپێش پیارۆیشتبوو، ویستیی‌پتەوو وورەی بەرزو دڵی‌قایم‌بوو ‎٠٠‎ هـــەرکاتێ تووشی تـــەنگ‌وچـــەڵەمەیەك ببوایەت ، یا کۆســـپێك بهاتایەرێگای ، هیـــوای پرشنگدار لەئاسۆوە خـــۆی پیشان‌دەداو هەموو گیروگرفتێکی لا ئاسان‌دەکرد ‎٠٠‎



ڕۆژێك دەمەوبـــەیان تازە تیشکی زێرینی‌خـــۆر دابووی لەلووتکەی چیابەرزەکان مامۆستا «رشیدالدین » لەناو ملانێکەوە شاری کاشغەری لێ‌دەرکەوت ‎٠٠‎ ئـەو ناو ملانەی کەلەمەپێش باوکی لەگەڵ هاوەڵـەکانیـا تیـــا دانیشـــتبوون‌و تەگبیری کاروفرمانی بانگـــەوازەکەیان تیاکردبوو ‎٠٠‎ بەمەش زۆر دڵخۆش‌بوو ‎٠٠‎

سوپاس‌گوزاری خوا ، بووبوە ویردی سەرزمانی ، بەتایبـــەت کەشاری‌کاشغەری لێ‌دەرکەوت‌و تائێســـتا بەبێ‌وەی « مصيبة » گەیشتووە ‎٠٠‎

ئەوشـــارەی کەماوەیـەکی‌زۆرە ئارەزومـــەندی

دیتنی خۆیو پاشاکەیو فـەرماندەکانیەتی •• ئـەوانەی کەباوکی دیتبوونیو باسی ئیسلامی بۆکردبوون ••

مامۆستا کەئامادمان‌بوو هۆی ئەوەبوو خوا شـەرەفی هەوڵدان‌وتێکۆشانی پێ‌بەخشیوە لەپێناوی ئیسـلامدا •• بۆیە پەیمانی لەگەڵ‌خوای خۆیا تازەکردەوە کـە قۆڵی مەردانـــەی لێ هەڵماڵێو گیانی‌بەخت‌کات لـــەپێناوی خوادا ••

## خەوە ، یان خەیاڵە ؟

لەوکاتەدا کە خۆر ماڵئاوایی کرد مامۆستا « رشیدالدین » پێی نایە ناوشارەوە بەدڵێکی پڕلەهیواو ئاواتەوە •• وایزانی بەئاسانی دەتوانیت بچێتە کۆشکی پاشاوەو چاوی پێبکەوێت ومەبەستەکەی پێبڵێت ، وە چەپکە گوڵی سەرکەوتن لەسەردەنێت‌و بەبەرزی ئەم ئاینە دڵشاد دەبێت •

بەڵام چەند ڕۆژێك لەناو شاری [ کاشغەر ] دا مایەوە ، بۆی دەرکەوت کاردکەی هەروا ئاسان نی‌یە •• ئەو کۆشکە کەورانەی کە لەهیواو ئاوات دروستی کردبوون لەوانەیە لەخەوو خەیاڵ زیاتر دەرنەچن !!

چەند ڕۆژێك هات‌وچۆی کرد بۆ دەرباری شاو دەیویست بچێتە ژوورەوە بۆلای پاشا ، بەڵام هەوڵەکەی بێسوود بوو « نەیتوانی بڕواتە لای پاشاو چاوی

پێ‌بکەوێت لەگەڵ ئەوەدا کە هەوڵو تەقەلایەکی زۆری‌دا » .. چونکە پاسەوانەکان نەیان دەهێشتو ڕێگەیان نەدەدا ..

ئەم گەنجە باریك‌و لاوازەی کە لەبەرچاودا نموونێکی وای‌نی‌یە چی‌بوێت لەپاشاو بۆچ دەیەوێت ببینێت ؟؟

چەند جارێك گەڕاندیانەوە .. چەند جارێك قسەی نالایەقیان پێ‌گوت‌و بەناشیرینی پاڵیان پێوەنا .. مامۆستای غەریب‌و نەشارەزا خەم‌و ماتەمینی دەبوونە میوانی ، بەڵام وەك پاڵەوانێك ملانەی دەکرد لەگەڵ بێ‌هیوابوون‌و ڕەش‌بینیدا !!

ڕاسپێری‌یەکەی باوکی دەهاتەوە پێش‌چاوی کە لەنەخۆشی سەرەمەرگدا پێی‌گوت : « تۆغا تەیمور ڕۆژێ لەڕۆژان دەبێتە پاشایەکی گەورە ، لەیادت نەچێت بڕۆی بۆلای .. سلاوی منی پێ‌بگەیەنە ، نەترسیت ئەو بەڵێنەی کەبەمنی‌داوە یادی بخەیتەوە » ..

غیرەت گرتی •• ڕقی داگیرسا •• خۆی بەخۆی دەگوت : دەبێ بچم بۆلای •• هەرچۆن بێ ، دەبێت چاوم پێی بکەوێت !! هیچ چارێکم نی یە ، جگە لەگەیاندنی سلاوی باوك و مامۆستام •• دەبێ ئەو بەڵێنەی یادبخەمەوە ، کەداویەتی بەباوکم !! ماوەیەك بێدەنگ بوو ، ئینجا دەیگوت : پاشە چیبکەم ؟ خۆ نایەڵن بە مەبەستەکەم بگەم !!

ئەگەر بەم شێوەیە بەدرێژایی تەمەنم لێرەبمێنمەوە ، وابزانم ناتوانم چاوم بەپاشا بکەوێت !! باشە دەبێ چیبکەم ؟ چۆن ڕاسپێری یەکەی باوکم بگەیەنم ؟

مامۆستا رشیدالدین بیرکردنەوەی خۆی خستەکار •• ماوەیەکی زۆر بیری لێکردەوەو ئینجا گوتی : بەڵێ •• بەڵێ •• جگە لەوڕێیە ڕێگایەکی ترم نی یە •• لەدوایدا چی دەبێت بابێت •• ئەرکەکە گەورەیە •• هەموو قوربانی دانێك لەپێناویا کەمە !!

مامۆستا بە دەوروبەری خۆیا لێرەولەوێ چاوی

دەگێڕاو وورد دەبووەوەو سەرنجی دەدا ، وەك ئــەوە بەشوێن شتێکا بگــەڕێ ، لەم گەڕانو سەرنجدانــەدا جێکایەکی بەرزی دیەوە وەك کردۆلەیەك خــانووی بەسەرەوە کرابوو ، نزیكبوو لەکۆشکی پاشاوە ، لەتاریکی شــەوا خۆی گەیاندە ئــەوێ ، چاوەڕوانی کرد تانوێژی بەیانی بوو .. پاشاو پاسەوان هــەموو لەخــەودا بــوون بەشیزۆری ناوشاری لیۆە دیاربوو ، دنیــا خامۆشبوو جموجووڵ نەمابوو ، تەنیا دەنگی پێی پاسەوانێكنەبێ کە لــەبــەردەم کۆشــکی پاشــادا هاتوچۆی دەکرد چیەیش نەدەبیسترا .. ئالەم کاتەدا بە هەموو هێزی خــۆی هاواری کرد : الله اکبر ... الله اکبر ... أشهد ان لا اله الا الله ... أشهد ان محمدا رسول الله ...

نەگەیشت بانگەکــەی تەواوکات .. سەربازەکان چوار دەورەیاندا و ڕایانکێشاو کامڵات دیشێ تاتوانیان لێیانداو بردیان ..

سەربازو پاسەوانەکان هەریەکەیان ئــەوی تریان تاوانبار دەکرد بەدرێغیکردن .. ئەگینا ئــەم گەلۆرە

« أبله » نەی دەتوانی پاشا سەخڵەت بکاتو لەخـــەو دایچڵەکێنێ ..

پاسەوانێك هاتو گوتی : پاشا داوای ئەو گەمژەیە دەکات ، کە خەوی خۆشی لێ تاڵکردووە .. مامۆستای بەستەزمانیان دایە پێشخۆیان بۆلای پاشا ، پاشایچی ؟.. چاوی پەڕیوەتە تەوقی سەری لەداخا ، ئاگری لێدەبارێ .. ئۆقرەی لێبڕاوە دەڵێی لەسەر زیلەمۆ وەستاوە ، چاوە چاوی بوو زوو بیهێنن‌و خەشی دڵیخـــۆی پێ بڕێژێ ..

مامۆستا « رشیدالدین » یان بردە بەردەم شا .. ئاگر لەناوچاوی دەباری مامۆستا گوێی نەدا بەو هەڵوێستە سامناکەو داوای یارمەتی لەخوا کرد .. مامۆستا کـــە نەدەترسا هۆی ئەوەبوو شتیوای چاوەڕوان کردبوو .. زیاد لەوە خۆیشی ئەم هەڵوێستەی دروستکرد ، چونکە ئەگەر وای نەکردایە بە ئەنجام نەدەگەیشت ..

کەپاشا پرسیاری لێکرد : هۆی چییە خەوت لەم خەڵکەزڕاندو بەم نیوەشەوە ئـــەو خەڵکەت سەخڵەت

کرد ؟؟ لەوەڵامی پاشادا گوتی : وەڵامەکەت نادەمەوە تاڕێگەم نەدەیت بەتەنیا خــۆم لەگەڵتا بدوێمو کــەس لامان نەبێ •• چونکە کارێکی گرنگم هەیەو دەمەوێ پێت ڕاگەیەنم !!

پاشــا ئیشارەیەکی کــرد هــەموو سەربازانو پاسەوانانو یارمەتیدەران دەوریان چۆڵکرد ، تەنیــا خۆیو مامۆستا مانەوە •

ئینجــا مامۆستا پەیامەکــەی باوکی پێگەیاند •• بەبیستنی ناوی مامۆستا « جمال‌الدین » ڕقو کینەی نەما •• بەڵکو ڕقو کینەکەی بووە خۆشەویستی کــەزانی ئــەمە کوڕی مامۆستای دەزگیرو ڕێ پیشاندەریەتی ، هەستاو ئەم لاولای ماچکرد ••

« تۆغاتەیمورخان » بیری لەوە دەکردەوە کە سێ ساڵ لەمەپێش لە نێوان خۆیو « جمال‌الدین » دا چی ڕوویدا ؟ لــەو کاتەدا خەوی دەبینی بەیەکگرتنەوەی وولاتی دابەش کراوی باپیرانیەوە ، واتیســـتا بوودتــە ڕاستەقینەکی واقیعی ••

بە « رشیدالدین »ی گوت : لەڕاستیدا « لەو کاتەوە وولاتەکەم کردۆتەوە بەیەك پارچە ئەو بەڵێنەم لـەیادەو لەسەر پەیمانەکەی خۆمم ، من چاوەڕوانی مامۆستابووم بەڵام دیار نەبوو ئێستاش زۆر شادمانم بەهـــاتنی تۆو بەخێربێیت » .

ماوەیەك تۆغا سەری دانەواند وەك ئەوە بیربکاتەوە ئینجا سەری بەرزکردەوەو گوتی : أشهد ان لا اله الا الله وأشهد ان محمدا رسول الله .. « لەو کاتەوە بەئاشکرا موسڵمان بوو » .. « تیشکی ڕۆژی ئیسلام دڵی ڕووناك کردەوەو تاریکایی کوفری لەناوبرد » ..

مامۆستا « رشیدالدین » لە خۆشیدا ڕەنگی وەك گوڵ گەشایەوە .. ســوجدەی شــوکـری بۆ خـوابردو زۆر سوپاس گوزاری خوا بوو کە ئاواتەکەی باوکی هێنایەدیو بروی بەئاینە مەزنەکەی دا ..

بەڵام ڕۆچوونی [تۆغاتەیمورخان] لە بیرکردنەوەدا مامۆستا « رشیدالدین »ی سەخڵەت کرد ، بۆیە پرسیاری کرد لەپاشا : هۆی پەژارەکەت چی‌یە ؟

ماموستا زۆر شادمان‌بوو کە پاشا گوتی :
بیر لەوە دەکەمەوە ڕێگایەکی ئاسان بدۆزمەوە ، بۆ قایل کردنی وەزیران‌و فەرماندەکانی سوپا •• بەڵکو ئەوانیش موسڵمان بین ••

ئینجا پاشا یەك ، یەك دەینارد بەشوێن فەرماندەکانی سوپادا ، ماموستا « رشیدالدین » لە تەنیشت پاشاوە دانیشتبوو ، ئەویش چاوەڕوانی هاتنی فەرماندەکان بوو ••

« یەکەم کەس کەداوای لێکرا موسڵمان بێ ، « ئەمیر تۆڵك » بوو ، پاشا هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو لەبارەی باسی ئیسلامەوە خوڕ خوڕ فرمێسك بەچاویدا هاتەخوارو گوتی : پاشا ، سێ‌ساڵ لەمەپێش من موسڵمان بووم ، لەسەر دەستی ماموستایەکی موسڵماندا ، لەو کاتەوە موسڵمانم ، بەڵام لەترسی تۆ نەموێراوە دەری ببڕم » !!

« تۆغا تەیمور خان هەستاو ئەم لاولای ماچ‌کرد » •

مامۆستا زۆر دڵخۆش بوو •• ئەو قسانەی باوکی یادکەوتەوە ، کە لەبارەی ئەو فەرماندانەوە بۆی باس کردبوو ، چۆن پێی گەیاندوون و ئامادەی کردوون بۆ ئەم کاتە پێویستی یە ، تا ببنە پاڵ پشتی پاشاو بەتەنیا نەبێ ••

بەو جۆرە پاشا دەینارد بەشوێن هەر فەرماندەیەکداو داوای لێدەکرد موسڵمان ببێ ، دەیگوت : پاشا ، من سێ ساڵ لەمەپێش موسڵمان بووم !! هەموو فەرماندەکان موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کردو پاشا بەم کارە زۆر شادمان بوو •• تەنیا یەك فەرماندەیان لەویادا موسڵمان نەبوو ، ئەویش کاتی خۆی دەمی مامۆستا «جمال‌الدین»ی پێ نەگەیشتبو !!

لەئەنجامدا ئەویش موسڵمان بوو •• وە ئاینی ئیسلام لە ناوشاری کاشغەردا بەتەواوی تەشەنەی کردو هەر صەدو شەست هەزار کەسی دانیشتوانی شار موسڵمان بوون ••

گیانی پاکی مامۆستا جمال‌الدین لە بوخاراوە دای

له شه‌قه‌ی باڵو به‌سه‌ر شاری کاشغه‌ردا په‌روازی ده‌کرد تا هاوبه‌شی بکات له خۆشی‌و شادی خه‌ڵکی کاشغه‌ردا ، به هاتنه‌به‌ری ئه‌و نه‌مامی باوه‌ڕه‌ی له‌وێدا ناشتی‌و به‌دوعاو پاڕانه‌وه‌ی به‌رده‌وامی خۆی هه‌میشه چاو دێری ده‌کرد ..

مێژوو نووسـانی جیهـان ئـه‌و راستی‌یه‌یان سه‌لماندووه‌و شایه‌تی ئه‌وه ده‌ده‌ن : که ئاینی ئیسـلام به‌سه‌ر مه‌غۆلدا سه‌رکه‌وت .. ئه‌و مه‌غۆله‌ی که به‌سوپای بێ‌ژماریانه‌وه گه‌ردنیان به‌وانه که‌چ‌کرد ، که ناوی خۆیان نابوو موسڵمان‌و فریان به‌ئیسلامه‌وه نه‌بوو ..

به‌ڵێ ، به‌وجۆره ئیسـلام بووه ئاینی دانیشتوانی سـارو ئاوایه‌کانی هه‌موو ئیمپراتۆریه‌تی یه‌کگرتووی « جه‌غتای »و له‌بت په‌رستی ڕزگاریان‌بوو ، مامۆسـتا جمال‌الدین له ناوگۆره‌که‌یدا دڵنیابوو که ئاینی ئیسـلام هێشتا هێزێکی گه‌وره‌ی هه‌یه بۆ خۆگرتن‌و سه‌رکه‌وتن .



**ئەم کتێبانەت خوێندۆتەوە ؟ :**

ئێستا دڵنیام/١٩٨٤

بەشێوازێکی ئەدەبی ڕەخنەی دوژمنانی ئیسلامت بۆڕوون دەکاتەوە لەبارەی قورئانەوە ٠٠ وەبۆت دەسەلمێنێ کەقورئان دانراوی پێغەمبەر نیە ، وە لەگاوورو جولەکەوە وەرنەگیراوە ، وە نەسازی « تناقض » لەقورئانا نیـە ، وە لەوبارەوە چەندەها بەڵگەی جوانو بەهێزت دەداتێ ٠٠

دوابڕیارم/١٩٨٥

کۆمەڵە چیرۆکێکی کۆمەڵایەتیە ، بۆت ڕوون دەکاتەوە پێش کەوتن چیە ؟ وە ئافرەت لەئیسلامدا چ مافێکی هەیە !! وە دەستت دەگرێو چەندەها شتی شاراوەت بۆ ڕوون دەکاتەوە ٠٠

رۆژوو لەئیسلامدا/١٩٨٥ :

باسێکە لەبارەی رۆژووەوە و کراوە بەچوار بەشەوە: بەشی یەکەم باسی رۆژووی فەرز دەکاتو ئەو شتانەش کە پەیوەندیان پێوەی هەبێ• بەشی دووەم: باسی سوودو حیکمەتەکانی رۆژوو دەکات، وە لەوبارەوە ئاراو ئەزموونی چەندەها نووسەرو پزیشکی جیهانیت بۆ ڕوون دەکاتەوە • بەشی سێیەم : رووژووی سوننەتو مەکروه باس دەکات لەگەڵ هەر بابەتێك بەڵگەت بە فەرمووده «حديث» بۆ دێنێتەوە •• بەشی چوارەم : ئەورووداوە گرنگانە باس دەکات کە لەرەمەزاندا ڕوویان داوە •

**پاش‌تێلانه : سێ کورته چیرۆکه‌و ڕوونی ده‌کاته‌وه‌که :**

- لادان له‌به‌رنامه‌ی خوا ده‌بێته هۆی تلێربوونه‌وه بۆ ناو زۆنگاوی به‌دبه‌ختی •
- موسڵمانی خاوه‌ن بڕوا له‌ڕوانگه‌ی ئیسلامه‌وه بۆ ده‌وروبه‌ری ده‌ڕوانێ‌و به‌و ترازووه هه‌موو شتێك ده‌کێشێ‌و بایه‌خ‌نادات به باوو نه‌رێتی سه‌پێنراو ••
- ته‌نیا ئیسلامه چاره‌سه‌ری ده‌رده‌کانی کۆمه‌ڵگا ده‌کات ••

## سەربازێكی نەناسراو :

ڕووداوێكی واقیعییەو هەڵێنجراوی ناودڵی مێژووەو دەریدەخات ئەمئیسلامە لەبەرامبەر هەموو كەردەلوولو ڕەشەبای بەهێزی دوژمنانیا چەند خۆگرو جیڕە !!

هەروەها دەوری چەند زانایەك پیشان دەدات كەوەك سەربازی نەناسراو لەپێناویا تێكۆشاونو گیانومالیان بۆ بەخت كردووە بۆئەوەی چاوەڕوانی پاداشت بن لەهیچ كەس جگە لەخوا ..

نرخی ٥٠٠ فلسە